تصوير ابو عبد الرحمن الكردي
د. شاكر نابولسی
منتدى إقرأ الثقافي
للكتب ( كوردي - عربي - فارسي )
www.iqra.ahlamontada.com
لەبارەی کوردو عیراق و
چەند پرسێکی فکری و سیاسییەوە
وەرگێڕانی: عەدالەت عەبدوڵلا

# لەبارەی کوردو عیراق و چەند پرسێکی فکری و سیاسییەوە

نووسینی

**شاکر نابولسی**

وەرگێڕانی

**عەدالەت عەبدوڵڵا**

مەکتەبی بیروھۆشیاری (ی. ن. ك)

سلێمانی ـ گەڕەکی سەرچنار ـ ١٢١

کۆڵانی: ٤٤

ژ. خانوو ـ ١

www.hoshiari.org
govarynovin@yahoo.com

* ناوی کتێب: لەبارەی کوردو عیراق و چەند پرسێکی فکری و سیاسییەوە

* نوسەر: شاکر نابولسی

* وەرگێرانی : عەدالەت عەبدوڵڵا

* دیزاینی ناوەوەو بەرگ: لەمیرە عومەر

* تیراژ: (١٠٠٠) دانە

* ژمارەی سپاردن: (١١٩٩)ی ساڵی ٢٠٠٩ ی وەزارەتی رۆشنبیری

* ژ. زنجیرە: (٢٩٦)

* لەبڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری ی. ن. ک

# ناوەڕۆك

## بەشی سێیەم: چەند بابەتێکی فکری و سیاسی



## بەشی چوارەم: گفتوگۆیەکی فکری - سیاسی

پێشەکی

# شتێك لەبارەی نابولسییەوە

سەرەتای ئاشنابوونمان بە نووسەر و بیرمەندی لیبراڵیستی عەرەب د. شاکر نابولسی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٩٨ .لەو مێژووەوە یەکێکین لەو خوێنەرانەی کە لەگەڵ خوێندنەوەی هەر وتارێك، لێکۆڵینەوەیەك، کتێبێکی ئەم نوسەرو بیرمەندەدا، پێش هەر شتێك، هەستمان بەدەنگێکی ئازاد، راشکاو، رەخنەگر، ئاراسیست، کردووە، ئەمە لەرۆژگارێکدا کە دەزانین ژمارەی ئەو نوسەرە عەرەبانەی لەئاوازی رەگەزپەرستانەدا نوقم نین و دەتوانن بەرووی کێشە و قەیرانە گرگرتووەکانی ئەمرۆی جیهان و ناوچەی خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا بکرێنەوە، یان تێڕوانێکی قوڵتریان بۆ هاوکێشە و رووداوەکان هەبێت، ئێجگار کەمن. کەمیشن ئەوانەی بوێرن پێچەوانەی شەپۆلی رۆشنبیریی سیاسیی تەقلیدیی عەرەبی یان هۆشیاریی سیاسیی رەسمیی دەوڵەت بیربکەنەوە و بنووسن، جیاواز لەو دید و گوتارە ئایدیۆلۆژییە ناسیۆنالیستییەش سەیری مرۆڤ و کۆمەڵگە و جیهان بکەن کە بەشێکی زۆری نوسەرانی عەرەبی تێدایە.

خەسڵەتێکی تری نابولسی کە لەزۆر نوسەری تری عەرەبی جیادەکاتەوە، رەخنەگرتنی بەردەوامێتی لەسیستەمی حوکمڕانێتیی ولاتانی عەرەبی. کەم رژێمی عەرەبی هەیە. نابولسی راشکاوانە قسەی لەسەر ستەمکاری و پێشلکردنەکانیان لەبوارەکانی ئازادییە سیاسی و مەدەنییەکان و مافی مرۆڤدا نەکردبێت. لە هەر کۆمەڵگایەکی عەرەبیدا ئازادی کەوتبێتە بەر هەڕەشەوە، ئەو دەستبەجێ وەك نوسەرێکی

لیبراڵخـواز، دەنگـی هـەڵبڕیوە، لەکوێـشدا سـتەمکاری و دیکتاتۆرییـەت ئامادەبووبێـت رەخنـەی تونـد و رادیکاڵانـەی خـۆی لـێ گرتـووە. رەنگـە هۆکـارێکی سـەرەکیش بـۆ گیرسـانەوەی لەتاراوگـە و بەتایبـەت لـە وڵاتـە یەگرکرتووەکانی ئـەمریکا و دووریـی لەنیـشتمانی خـۆی ( ئـوردن)، هـەر پەیوەندیی بەو روحە ئازادیخوازە یاخییەوە هـەبێت کە هەیەتی و، ستەمی ئەو دەسەڵاتە عەرەبییانـەش کە رێ نادەن ئازادانە بیربکاتـەوە و بنوسـێ و هەڵوێست وەربگرێت. کەلەپوری نوسینەکانی نابولسی لەسەر رژێمی بەعس لەعێراقـدا (١٩٦٨-٢٠٠٣) و، لـەپێناوی گـەلانی عـێراق و داکـۆکی کردنـی لەگـەلی کـورد و پـشتگیریی کردنیشی لەپرۆسـەی ئـازادی، کەلـەپورێکی رۆژنامەنووسـی و رۆشـنبیریی دەوڵەمەنـدە. مـن بەدرێـژایی پێـنج سـاڵی رابـردوو، واتـە لەگەرمـەی دەسـتپێکردنی پرۆسـەی ئـازادیی عێراقـەوە ٢٠٠٣/٤/٩ هەمیـشەو بـەپێی بـوار و توانـا و کـات چـاوێکم لەسـەر ئـەو ئەدەبییاتە میدیایی و رۆشنبیرییەی جیهـانی عـەرەب بووە کەتایبـەت بوون بەم رووداوە گرنگە. لەو ئاستەدا جگە لـە بیرمەنـدانی وەك هیـشام جـەعیز، کەنعان مەکیە، عەلی حەرب، بورهان غەلیون و فوئاد عەجمی وهەنـدێ ناوی تـر، هـیچ نوسـەرێکی تـری دیـاری عـەرەبم نـەدیوە وەك د. شـاکر نابولـسی رەخنەی لەستەمکاریی بەعس گرتبێ و خـاوەن تێگەیشتنێکی جیاواز بێت بـۆ روخـانی ئـەو رژێمە. نابولـسی لەگـەڵ ئـەم رووداوە مێژووییـەدا دەسـت بەنووسـینی دەیـان و سـەدان وتـار لەکـەناڵ و رۆژنامـە وسـەکۆ و ماڵپـەڕە جیاوازەکانـدا دەکـات بـۆ ئـەوەی لـەم پرۆسەیەدا ئازادبوونی گـەلانی عێراق بەرووداوێکی گرنگ بنرخێنێ، بۆ ئـەوەی لەناو هەڵای ترسیش لەداگیرکاریی ئــەمریکا ئــەو دەســکەوتە مێژووییــە بەکــەم نــەگیرێت کــە رزگــاربوونی عێراقییەکانە لەدیکتاتۆرترین رژێم لەدنیادا. ئاستێکی تـری فکری نابولـسی

بیرخستنەوەی کێشەی کوردە لەعێراق و داکۆکیکردنێکی ویژدانییانە و ئاکارییانەیە لەم کێشەیە، دواتر هەڵوێستومرگرتنی رەخنەگرانەش لەزۆر برگەی مێژوویی کەلەدوای پرۆسەی ئازادیی عێراقەوە دێنەگۆڕێ.هەموو ئەو سەرمایە ئەخلاقی و رۆشنبیرییەش کەئەم نوسەرە بۆ خۆی کۆی دەکاتەوە و بێباکانەش رووبەڕووی تۆمەت و هەڕەشە و ناو و ناتۆرەی نوسەرە قەومەجی و توندڕەوەکان دەبێتەوە،ئارەزوویەکی گەورەی لا دروستکردین بۆ ئەوەی، بەهەر شێوەیەك بێ، پەیوەندیی پێوە بکەین.

سەرەتای پەیوەندیمان سالی ٢٠٠٦بوو، ئەمەش بەهۆی پۆستی ئەلکترۆنی و تەلەفۆنەوە، دواتر رێککەوتین دیالۆگێکی دوورودرێژ ئەنجام بدەین و لەسەر چەند بابەتێکی پەیوەندیدار بەعێراق و کورد بدوێن. ئەو دەستبەجێ ئەم بیرۆکەیەی قبوڵکرد تا دواتر کار گەیشتە ئەوەی لەسەر کۆنتراکتێکی رۆژنامەوانی رێکبکەوین کە بریتی بوو لە نووسینێکی هەفتانە بۆ رۆژنامەی رۆژانەی کوردستانی نوێ و وەرگێرانی بابەتەکەش لەلایەن بەندەوە.

دوای ئەو رێککەوتنە کەخۆشبەختانە بەخەمخۆریی هەردوولامان و هاریکاریی گەورەی رۆژنامەی کوردستانی نوێ بەزوویی چووە بواری جێبەجێکردنەوە، سەرەتای هاوینی ٢٠٠٧یش بوارێك هاتەپێش لەنزیکەوە یەکتر ببینین، ئەویش بەبۆنەی میوانداریکردنیەوە لەلایەن دەزگای ئەلمەدا بۆ فێستیڤاڵی ساڵانەی مەدا کە ئەو جارەیان لەهەولێر سازکرا، بەر لەو بەروارەش دەرفەتێکم بۆ هەڵکەوت لەشاری زیورخ-ی سویسرا بەیەك بگەین بەتایبەت دوای ئەوەی کە دەواتنامەیەکی رەسمیم لەرێکخراوی داکۆکیکردن لەکەمینە نەتەوایەتییەکانی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە پێگەیشت بۆ ئەوەی وەك نوسەرێکی کورد بەشداری بکەم.هەڵبەت نابولسی

زۆری بەلاوە مەبەست بوو کە بەشداربین و لەویٚ بەدەیان ناوی تری عەرەب ئاشنابیم کە دیدێکی ئینسانی و ئەخلاقییان بۆ کێشەی کورد هەیە، بەڵام لەلایەك لەبەر خراپی باری ئاسایشی شاری بەغدا کە باڵوێزخانەی سویسرا-ی لێیە و درەنگ گەیشتنی داوەتنامەکەش لەلایەکی دی، ئەو سەفەرەمان سەری نەگرت، بەڵام ئەوەی سەریگرت درێژەکێشانی کۆنتراکتەکەمان بوو لەگەڵ نابولسی کە خۆشبەختانە تارۆژگاری ئەمڕۆش بەردەوامە بە گۆڕانکارییەکی بچووکەوە، ئەویش وەرگێرانی وتارەکەیەتی لەلایەن دوو رۆژنامەنووسی هاوکارمان لەکوردستانی نویٚ کە ئەوانیش دلاوەر عوسمان و ئاری عەلی غەریب ـ ە، ئەمەش بەبۆنەی سەرقاڵبوونی منەوە بەکاری رۆژنامەنووسیی تری رۆژنامەکەوە.

ئەوەی لەم کتێبەدا دەیخوێننەوە بەشێکە لەکۆی ئەو وتارانەی نابولسی کەلەسەر عێراق و کورد نوسیوینی وبەندە وەرمگێراون. بیرۆکەی بەکتێبکردنی ئەم وتارانەش پشتگیری و پشتیوانیی نابولیسی-شی بەدەستهێناوە، بێگومان ئامادەیی دڵسۆزانەی مەکتەبی بیروهۆشیاریی(ی.ن.ك) یش بەچاپکردنی، هەڵوێستێکە جێی رێز و پێزانینمانە. ماوەتەوە بڵێم وتارەکانی ناو ئەم کتێبە لەسات و کاتی جیاجیادا نوسراون، بەشێکی ئەو بابەتانەش کە ئەم کتێبە لەسەریان نەوەستێت کۆتاییان هاتووە یان یەکلابوونەتەوە، بەڵام ئەوەی تیایدا بەزیندوویی دەمێنێتەوە دوو شتە، یەکەم: هەڵوێستی ئازادیخوازانەی نوسەر و بیرمەند خۆی، دووەم: سیستمی بیرکردنەوەو تێڕوانینی لەئاست کێشەو قەیران ورووداو و دیاردەکانی ناو جیهانی کورد و عیراق و جیهان.

**عەدالەت عەبدوڵڵا**

# مافی لێپرسینەوەی کورد،
# لە چەتەکان ..!

- ١ -

بـواری ئـەوە نییـە مـشتومڕ بکـرێ لەسـەر ئـەوەی کـە لـەهاووڵاتیبوونی عیراقییانـەداو لـە دامەزرانـدنی دەوڵـەتی فیـدراڵیی عیراقـیش لەپاشـەڕۆژدا، کـوردی عـێراق تـازە بوونەتـە هاوبەشـی سـوننەو شـیعە و هاوبەشـی مەسـیحییەکان و تـەواوی نـەژاد و مەزهـەب و پێکهاتـەکان. کـورد هـەقی خۆشیانە وەکـو خـەڵکی دی لـە هاووڵاتیـانی عـێراق هاوبـەش-ی کـارابن لـە یشتمانی عیراقدا و، سامانی عیراق و دەسکەوتەکانی بپارێزن و لەسەر هەر ،ینارێکی عیراقیش بە لێپرسینەوەی ورد لە بەرپرسانی حکومەتی ناوەندی پرسنەوە. بە عەقڵـەوە ناچـێ و قبـوڵیش ناکرێـت کـە حکومـەتی ناوەندیی یراق لە ژێر باری بەرپرسیارێتیی ئەو گەندەڵی و دزینانەدا نەبێت کە بەغدا ەم ڕۆژگارەدا بە خۆوەیان دەبینێت و ئەوەیان دووپات کردووتەوە کە ئەوە

ئێستا هەندێ لە بەرپرسانی عیراق خۆیانن کە دزی لە عیراق دەکەن نەك داگیرکەری ئەمریکی یان بەریتانی. ئەو ئابڕوچوون و بۆنە پیسانەش کە لوت توشی هەڵامەت دەکەن و رۆژانە لە بەغداوە دێنە دەرێ ئامارژە بەوە دەکەن کە نوخبەی سیاسیی عیراق کە لە دوای پرۆسەی ئازادییەوە دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست لە قەیرانێکی ئەخلاقی و قەیرانی بوونی پرەنسیپی سیاسیی شەریفانەدان و، بگرە روخانی سەدام و ئازادبوونی عیراق خراپییەکانی نوخبەی سیاسیی جیاواز-ی عیراقی ئاشکراکرد. دوای هیچ جەنگێکی ئازادکردنی هیچ گەلێکیش لە گەلانی مێژوودا رووی نەداوە گەندەڵی و دزی هەبێ وماڵی گشتی بەتاڵان ببرێ، بەڵکو زانراوە کە گەلانی ئازاد و رابەرانی ئەم گەلانە لە هەر ماوەیەکی رابردوو پەرۆشتر بوونە بۆ نیشتمان و پارە و پوولی نیشتمان، چونکە نیشتمان لە دوای هەموو شەرێکی رزگاریخوازانە دەبێتە موڵکی هاوولاتیان نەك هی فەرمانڕەوا ستەمکارە گەندەڵەکان. هەموو هاوولاتییەکیش، جا بەرپرس بێت یان نابەرپرس، هەست دەکا کە ئیدی نیشتمان ماڵی ئەوە و پێویستە پارێزگاری لێبکا و لە دژی چەتەکان و رێگەکانیش بەرگریی لێ بکات.

## - ٢ -

چاودێرانی ناو عیراق و دەرەوەی عیراق و ناو نیشتمانی عەرەبی و دەرەوەی، پێشبینی ئەوەیان نەدەکرد کە تالانکردن و راو و رووت و گەندەڵی لە بەغدادا بگاتە ئەو رادەیەی کە ئێستا هەیە، بە تایبەتی لەبەر ئەوەی ئەو نوخبانەی کە بە دوای فەرمانڕەواییکردنی بەغدادا هاتن لەو نوخبە ئاینییە رۆشنبیر و خوێندەوارانەن کە لە خوای خۆیان و لە

ویژدانیان دەترسن و لەو هەقەش کە نیشتمان و خەڵکەکەیان هەیانە. بەڵام کە عیراق ئاوا وەربچەرخێ بۆ بانکێکی بەتاڵانبراو و، بۆ کێڵگەی گەندەڵی و، بۆ گۆڕەپانی ئاژاوە و، بۆ قەسابخانەیەکی رۆژانە بۆ عیراقییەکان، ئەوە دەبێ کورد لە ئاست حکومەتی بەغدادا هەڵوێستێکی روون و راشکاوانەی هەبێت.

تەنها ئەوە بەس نییە بۆ لێپرسراوان لە هەرێمی کوردستاندا کە لە بواری داراییدا لەسەر ئەو دزینانەی کە لە گیرفانی هەموو عیراقیەکان و لە ناویاندا کورد دەدزرێت، لە بەرپرسانی بەغدا بپرسنەوە، بەڵکو لەسەر لێپرسراوان لە هەرێمی کوردستان و رابەری هەردوو پارتەکە: یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان پێویستە کە لەسەر ئەو لەبندەستدەرچوونەی باری ئاسایش و ئارامی و، لەسەر ئەو ئاژاوە ئەمنییەی بەغداش، کە وەك بڵێی نە دەسەڵات و نە دەوڵەت و نە حکومەت لە بەغدادا نەبێ کە وا نییە، لە بەرپرسانی بەغدا بپرسنەوە. دیارە هەرێمی کوردستانیش بەشێکی گەورەیە لە عیراق، ئەوەی لە رووی رزگارکردن و بوونی هێزی بیانیشدا لەعیراقدا روویداوە ئەوە لە هەموو عیراقدا و بە هەمان شێوە روویداوە. لەم رووەوە سەیربکەن کە کورد چۆن توانییان باشییەکانی رزگاربوون وەربگرن و خراپییەکانی بخەنە لاوە، تەماشاش بکەن کە کورد چۆن سوودی لە رزگاربوون وەرگرت بۆ بونیادنانی هەرێمەکەیان لە کوردستان، ئەو هەرێمەی کە ئومێد دەکەین لە پاشەڕۆژدا کوردی تورکیاش ( کە ٥٠٪ ی کوردە لە جیهان و بە ژمارە ١٣,٥ ملیۆن کەسە) و کوردی ئێران ( کە ٢٤٪ ی کوردە لە جیهاندا و بە ژمارە ٦,٦ ملیۆن کەسە) و کوردی سوریا ( کە ٥٪ ە و بە ژمارە ١,٥ ملیۆن کەسە) پەیوەندیی پێوە بکەن. تەماشا بکەن کە چۆن هەولێریش بە هەوڵی رۆڵەکانی و هۆشیارییان

و واقعبینیی سیاسییان سوودیان لەو دەرفەتە سیاسی و ئابوورییە رەخساوانە وەرگرتووە، وای لێهاتووە لە گەشەکردن و ئاسایش و پەرەگرسەندنیدا کێ بەرکێی " بەغدای ئەلرەشید " دەکات.

**ـ ٢ ـ**

هەولێر ماڵ خۆیەتی کە لەسەر دزینی پارەوپولی بەتاڵانبراوی گیرفانی عێراقییەکان و لە ناویاندا گیرفانی کوردەکانیش، لە بەغدا بپرسێتەوە. پارەی دەوڵەتی عێراق تەنها پارەی شیعە نییە، بە تەنها پارەی سوننە-ش نییە، بە تەنها پارەی کورد و پارەی تایەفەکان و پێکهاتەکانیش نییە بە تەنها. ئەو پارەیە پارەی هەموو عێراقییەکانە و هەرهەموویان و بێ لێدەرکردن. هەقی هەموو لایەکیشیانە کە لە هەمووان بپرسنەوە.

دوایین ئەو دزینانەی کە هەواڵەکان باسی دەکەن، دەڵێ: بەرپرسان لە وەزارەتی بەرگری لە بەغدا، بە گوێرەی راپۆرتەکان؛ بەر لە هەڵبژاردنەکان کە لە ساڵی ٢٠٠٥دا ئەنجام دران، زیاتر لە نیو ملیۆن دۆلاریان خواردووە. تۆڕی تەلەفزیۆنی CB News ی ئەمریکیش لە بەرنامەی " ٦٠ خولەك"دا باسی تۆماری دەنگیی یەکێ لە گومانلێکراوان دەکات کە پێدەچێ مشتومڕی بێت لەسەر حەواڵەکردنی ٤٥ ملیۆن دۆلار بۆ حسابی یەکێك لە گەورە راوێژکارانی سیاسی لە وەزارەتی بەرگریی حکومەتی کاتیی پێشووی عێراق. تەلەفزیۆنەکە بەپێی قسەی لێکۆڵەرە عێراقییەکان، دەڵێ: وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیا بۆ یارمەتی نواندن لە گێڕانەوەی ئەو پارانە، یان دەستگیرکردنی ئەوانەی گومانی ئەوەیان لێ دەکرێ کە ئەو پارانەیان خواردبێت و ئەوانەی کە زۆربەیان لە وڵات هەڵهاتوون، هیچ

کۆشـشێکی زۆر ناکـەن. وەزیـری دارایـی پێـشووی عیراقـیش ئـەوەی بەتەلەفزیۆنەکە وت کە: (( هـیچ پـشتگیرییەکی شێلگیرانەی رەسمییـان نـە لەوولاتـە یـەکگرتووەکان یـان بـەریتانیا یـان هـیچ دەوڵـەتێکی عـەرەبیی دراوسـێیەوە بـە دەسـت نـەهێناوە)). عـەلاوی کـە لـە سـەرەتای ئـەم ساڵدا لـەکاتی پێکهێنـانی حکومـەتی نـوێی عیراقـدا پۆسـتەکەی بـەجێ هێـشت، ئەوەشی وت کە :(( تاقە لێکدانەوەیەك کە بشێت پێشکەشی بکەم ئەوەیە کە، دەرکـەوت زۆرێـك لـەو کەسـانەی کـە لـە عیراقـی نوێـدا لـە ناوەنـدەکانی دەسەلات و هێزن، تێوەگلاون )). بەردەوامیش بوو و وتی کە : (( ئەگەر ئەو جـۆرە کەسـانە ببرێن بـۆ دادگـایی کـردن ئـەوە بـە خـراپ بـۆ ئـەو خەڵکانـە دەشـکێتەوە کـە پـشتگرییان کـردوون و لـە پێگـەکانی هێـز و دەسـەلاتدا دایاننـاون )). گـەورەترین گومـانلێکراویش لـەم دۆزەدا بـەپێی قـسەی ئـەو تەلەفزیۆنـە" زیـاد قـەتتان" ە کـە لـەو دەمـەدا بەرپرسـی لیژنـەی کـڕینی کەلوپەلی سەربازی بووە لەو کاتەی کە وەزارەتی بەرگری ٢,١ ملیار دۆلاری بۆ کڕین تەرخان کردووە. عەلاوی ئەوەشی خەملاندووە کە لە نێوان ٧٥٠ تا ٨٠٠ ملیـۆن دۆلار لـەو پارانـە دزرابێـت. لەلایـەکی تـرەوە، قـازی " رازی ئەلڕازی " سەرۆکی کۆمسیۆنی دەستپاکیی عیراق کە لە گەندەڵیی حکومیی کۆڵیوەتـەوە، دەڵـێ : زۆربـەی ئـەو پارانـەی کـە دزراون لـە کەرەسـەی کـۆن و نەشیاودا خەرج کراون.

- ٤ -

ئەمە مشتێکە لە خەروارێك، ئەمە بەتەنها هەر ئەوەشە کە لەو هەواڵانەوە دەیبیستین کە لە بەغداوە دێن. دەشێ هەواڵی زۆرتریش هەبێت لەسەر دزین و گەندەڵیی گەورە. هەر ئەمەشە بەڵای دووەم کە ئێستا بەسەر عێراقەوە بۆتە بەڵا دوای بەڵای لەبن دەستدەرچوونی دۆخی ئەمنی و بەڵای کردەوەکانی رفاندنی خەڵکی مەدەنی کە میلیشیا تایەفەگەرە جیاوازەکان و ئەو تیرۆریستانە ئەنجامی دەدەن کە لەو دیو سنوورەکانەوە و لە وڵاتانێکەوە هاتوون کە نایانەوێ عێراق رزگاربێ و سەقامگیر بێ و پێشبکەوێ و، دیموکراسیی تێدا بچەسپێت.

کورد وەك چۆن هاوبەشن لە یەك نیشتمان و خاك و ئاو و چارەنووسدا، ئاوهاش لە پارەو پولی گشتیدا هاوبەشن. مافی خۆشیانە کە داوا لەحکومەتی بەغدا بکەن حسابێکی گشتگیر . ی سامانەکانی عێراق ئاشکرا بکات کە لەبەرەبەیانی ٩ ی نیسانی ٢٠٠٣ەوەو لەساڵای رابردوودا بە فیڕۆی داوە. ئەمە مافی خۆیان و مافی رۆڵەکانیانە کە لەدوای خۆیانەوە دێن. ئومێدەواریشن مەسەلەکە نەگاتە ئەوەی کە کوردستان پەنا بەرێتە بەر دادگاییەکی نێودەوڵەتی بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی لەگەڵ بەغدادا، ئیتر ئەو ناکۆکییانە بێت کە پەیوەستن بە گەندەڵی و بە تالانبردنی پارەوپولی گشتییەوە، یان ئەوانەی کە پەیوەستن بە گرێبەستەکانی تایبەت بە نەوتەوە کە حکومەتی هەرێم ئیمزای کردوون و، دانی بڕی ٤٨٥ ملیۆن دۆلار-یش کە لە بودجەی ئەم ساڵدا ماوەتەوە و هەندێ لایەن لە حکومەتی عێراق لارییان لە خەرجکردنی هەیە، ئەمە لەگەڵ پشکی کورد لە نوێنەرایەتیکردنیش لە باڵوێزخانە و قونسوڵییەکانی عێراقدا لە دەرەوە.

# کورد لە (( گفتوگۆی عەرەب )) دا

— ١ —

ماوەکی کەمە دۆزی کورد خەریکە لەناوەندەکانی رۆشنبیران و دەستەبژێری عەرەبیدا بایەخێکی گەورەی پێ دەدرێت. ئەوەش لەئەنجامی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەیە کە دەسەلاتی سیاسی لەهەرێمی کوردستانی عیراق لەبەڕێوەبردنی ئەم هەرێمەدا بەدییهێناوە و لەوەشدا کە کردوێتی بەفیدرالییەکی نموونەیی بۆ باقی هەرێمەکانی عیراق لەرووی پاکێتیی سیاسی و، ئاسایشی سەقامگیر و، گەشەکردنی ئابوری و، هاتنی سەرمایەگوزاریی عەرەبی و رۆژئاوایی و، پێشکەوتنی رۆشنبیری و، ئامادەیی وڵاتانی جیهان بۆ یارمەتیدانی ئەم هەرێمە لەباری سیاسی و ئابوری و رۆشنبیرییەوە. هەموو ئەو دەرکەوتانەمان لەمیانەی ئامادەبوونی زیاتر لە پێنج سەد رۆشنبیری عیراقی و عەرەبی لە فیستیڤاڵی پێنجەمی رۆشنبیریی رۆژنامەی ( المدى ) لەمانگی ئایاری ٢٠٠٧ی رابردوودا بەدی

کرد. لەو فێستیڤاڵەدا چاومان بەسەرۆك جەلال تاڵەبانیش کەوت و گفتوگۆمان لەگەڵدا کردو گفتوگۆی لەگەڵدا کردین. ئەم چاوپێکەوتنەش یەکەمین چاوپێکەوتنی رۆشنبیرانی عیراق بوو لەناوخۆ و لەتاراوگە-ش و یەکەمین چاوپێکەوتنی رۆشنبیرانی عەرەبیش بوو بەگشتی لەگەڵ یەکەم سەرۆك کۆماری دیموکراتدا لەوڵاتێکی عەرەبیی وەك عیراقدا.

لەسەر نموونەی هەرێمی کوردستانی عیراق، دەبوایە ئێستا هەموو عیراق وابووایە، هەموو عیراق بەئاسایش و سەقامگیری و ئازادی و دیموکراسی شادبوایە ئەگەر ئەو بێ ئومێدبوونە گەورەیە نەبووایە لەو دەستەبژێرە حوکمڕانەی کە لەبەغدان و لە گەندەڵییان، ئەگەر دەستوەردانی وڵاتانی دەرودراوسێش نەبووایە لەکاروباری ناوخۆ ـــ ی و، ئەگەر تووڕەیی و دڵەڕاوکێ و ترس و تۆقینی رژێمە حوکمڕانە دیکتاتۆرییە گشتگیرەکانی وڵاتانی دراوسێ نەبووایە لەوەی کە" ئەوەی لەعیراقدا لەبەرەبەیانی ٩ی نیسانی ٢٠٠٣ی پیرۆزدا روویدا لەو وڵاتانەشدا دووبارە ببێتەوە و رژێمە دیکتاتۆرییەکانی حوکمڕانی دابڕوخێن و ملی زۆرداردان بەپەتا هەڵواسرێ هەروەك لەعیراقدا روویدا و لە چەند رۆژی داهاتووشدا روودەداتەوە، ئەویش بەهەڵواسینی (( عەلی کیمیاوی)) تاوانباری ((شاڵاوەکانی ئەنفال )) و دەستەڕاستی زۆردارەکەی بەغدا، وەك سزایەك لەبەرامبەر ئەو تاوانە تۆقێنەرانەی کە لەکوردستانی عیراقدا کردوونی و ئەنجامیداون.

## ـ ٢ ـ

کەواتــە ئــەزموونی دامەزرانــدنی هــەرێمی کوردســتانی عــێراق ئــەزموونێکی نموونــەیی ســەرکەوتوو بــوو تــا ئــەو رادەیــەی کــە مــن خــۆم لەوتارێکی پێشوومدا ( عیراقییەکان لە تاراوگەی ئاورشمیدا ٢٠٠٧/٥/٧) بانگەشەی ملیۆنەها لەو عیراقییانەم کردووە کە لە تاراوگەدان بگەڕێنەوە بۆ هەرێمی کوردستانی عیراق و بەشداری لە ئاوەدانکردنەوەو گەشەپێدانیدا بکەن لەجیاتی ئەوەی لە تاراوگەی عەرەبی و رۆژئاواییدا بژین.

پێنەچــێ ئــەزموونی دروســتبوونی هــەرێمی کوردســتانی عــێراق دەســـتەبژێری ناسیۆنالیــستیی عــەرەب ـ ی گوێقــولاخ کردبــێ، ئــەو دەستەبژێرەی کە لەرابردوودا نکولّیی لەهەر نەتەوەیەکی دی لەجیهانی عەرەبیدا دەکرد جگە لە نەتەوەی عەرەب کە زۆربەی حزبە عەرەبییە ناسیۆنالیستی و ئاینیەکانیش وەك تاقە نەتەوەی نیشتمانی عەرەبیان دانابوو، بەتایبەتی حزبی بەعس کە زۆرێك لەپرەنسیپ و چەمکە سیاسی و ناسیۆنالیستییەکانی خۆی لەفکری ناسیۆنالیستیی ئەڵمانی و فکری سیاسیی نازییانە و فاشییانە بەشێوەیەکی تایبەتی وەرگرتبوو، هەروەك لەسەرەتاوە لەماوەی فەرمانڕەوایی ناسیۆنالیستییانەی (١٩٤١)ی رەشید عالی گەیلانی (١٨٩٢ – ١٩٦٥ )دا دەرکەوت کە لەگەڵ ئەڵمانیای نازیدا بوو بە هاوپەیمان و لە بەرلین سەردانی هیتلەر ـ ی کرد و ئیزگەیەکی ناسیۆنالیستیی عەرەبیی لە بەرلینی نازیدا ( لەبەرلینەوە درود بۆ عەرەب بنێرن ) دروستکرد، ئەوەش بەسەرپەرشتیی میدیاکاری ناسراوی عیراق یونس بەحری. ئەڵمانیای نازییش لەو دەمەدا بەپاڵەوانی شۆڕشگێڕ و سەرکردەی نەتەوەیی لەقەڵەمدا، پاڵەوانێك کە دەیەوێت کۆلۆنیالیزمی

بەریتانی و فەرەنسی: دوو دوژمنەکەی ئەو دەمەی ئەڵمانیای نازی، نەمێنێت.

## - ٢ -

پێش ئەو کۆڕەی کە ( مرکز الأردن الجدید ) لە مانگی رابردوودا لە عەمان لەژێر ناونیشانی ( برایەتی عەرەبی – کوردی بۆ کوێ ؟ ) سازیکرد و تیایدا مشتومڕێکی پۆزەتیڤ لەبارەی موحازەرەکەی وەزیری رۆشنبیریی پێشووی هەرێمی کوردستانی عیراق کرا لەنێوان دەستەبژێرانی جیاجیای ئوردن کە لە دوو وتاری پێشوودا لەسەر رووپەڕەکانی ئەم رۆژنامەیەدا خستمانەڕوو، گۆڤاری ( حوار العرب ) کە ( مؤسسة الفکر العربي ) لە بەیروت دەریدەکات، لە ساڵی ٢٠٠٦دا تەوەرێکی تایبەتی لەژێر ناونیشانی ( کورد لەگێژەنی عەرەبدا ) تەرخان کرد و هەندێ بیرمەندی عەرەب تیایدا نوسییان، لەوانە (( د. مونزر ئەلفەزل)) ئەندامی کۆمەڵەی نیشتمانی عیراق و ئەندامی لیژنەی نوسینی دەستوری هەمیشەیی و، (( نەسیم خوری )) بیرمەندی سیاسیی لوبنانی و، (( خورشید عەلی و ئازاد ئەحمەد عەلی و تەها خەلیل و رۆستەم مەحمود )) کە ئەمانە نوسەرانی کورد– ی سوریان و، (( مستەفا ئەلجوزو)) لێکۆڵەر و ئەکادیمیی لوبنانی و ((عومەر کۆش )) نوسەر و لێکدەرەوەی سیاسیی سوری و (( قوسەی حسێن )) ئەکادیمیی لوبنانی.

توێژەران بەسەر ئەو بابەتانەدا کە لەسەریان نووسین لەنێوان مێژووی کورد لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و، (( کورد، یان دەوڵەتی مەحاڵ ))

کــە کــورد لەمێــژە هــەوڵی دامەزرانــدنی دەدات هــەروەك نەســیم خــوری نوسیبووی، دابەشبوون. هەندێ لەتوێژەرانی کورد تاووتوێی پرسی ((کورد و فیدراڵی و پاشەڕۆژی عیراق )) یان کرد. هەر لەناو توێژەرەکاندا هەبوو کە چووەسەر پرسی (( کورد و ڕەوتەکانی ئیسلامی سیاسی )). دۆزی کورد لـە ســوریا ــ ش بــووە جێــی توێــژەرانی کــوردی ســوری. هــەروەها کــوردی تورکیاش لەم توێژینەوانەیان بەرکەوت بەو توێژینەوەیەی کە (( ڕۆستەم مــەحمود)) لەســەری نوســی. ئەمــە جگــە لــە پێــشەکییەکی ســەربار لــەژێر ناونیــشانی (( هەڵــەکانی کــورد و ماندووبوونــەکانیان لەرۆژهــەڵاتی ناوەڕاســتدا)) بەپێنوســی (( محەمــەد ئــەلرمێحی ))ی نوســەری سیاســی و ئەکادیمیی بەناوبانگی کوێتی و سەرنوسەری پێشووی گۆڤاری ( العربي )ی کوێتی. لەم پێشەکییەدا ئەلرمێحی مێژووی کورد-ی لەناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا خستۆتەڕوو و باسی ئەوەی کردووە کە ٢٠٪ ی گەلی تورکی لەکورد پێکدێ و، ٢٠٪ ی گەلی عیراقیش و، ٩٪ ی گەلی سوری و، ٧٪ ی گەلی ئێرانییش لە کوردن. ئەم ئامارانەش هەموویان ئاماری وورد نین، چونکە ڕێژەی کورد لەناو ئەو گەلانەدا زیاترە لەو ڕێژانە و ئامارگەلێکی فەرمییش بۆ ئەو ڕێژانە نییە. ئەو ژمارانەش کە بەو جۆرە بڵاوکراونەتەوە، هەمووی ژمارەگەلێکی سیاسین و زۆر کاریان پێ ناکرێت.

لە پێشەکییەکەیدا ئەلرمێحی ئەوەی پوختکردۆتەوە کە کورد لەپاڵ عــەرەب و ئێرانییــەکان و تورکەکانــدا چــوارەم نەتــەوە پێــك دەهێــنن لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. ئەلرمێحی دانی بەوەشدا ناوە کە نەتەوەی کورد تاقــە نەتــەوەی مــافخوراوی ڕۆژهــەڵاتی ناوەڕاســتە کــە لەبازدانــەکانی پێکهێنــانی نەتــەوەدا لــەدەمی ســاڵانی پێکهــەڵپرژاوی ســەدەی بیــست ((نیــشتمانی نەتــەوەیی ))ی خۆیــان بەدەســت نــەهێنا. بەعــسی عــیراق کــە

لەنێوان سالانی ١٩٦٨-٢٠٠٣دا حوكمی عیراقیان كرد دروشمی ((ناسیۆنالیزمی عەرەبی ))یان بەرزكردەوە لەدەمێكدا كە كورد یەك لەسەر سێی گەلی عیراقیان پێك دەهێنا. ئەلرمێحی لەكۆتایی ئەو پێشەكییەی باسمان كرد، دانی بەوەشدا ناوە كە كورد لەعیراقدا توانیویانە هەرێمێكی سیاسیی ماقوڵ لەم وڵاتەدا پێك بهێنن كە بە هەلومەرجێكدا تێپەڕیوە و تێدەپەڕێ دەشێت لەناوچەكانی دیكەدا دەستەبەرنەبووبن. لەكاتێكدا كە كورد لەتوركیادا دوچاری سزاوئازارێك بوونەتەوە ڕەنگە سەختتربێت لەو سزاوئازارەی كە لەسایەی حوكمی سەدام حسێندا دوچاری هاتوون، ئەمەش ئەو پرسەیە كە لەوتاری داهاتوومانددا قسەی لەسەر دەكەین ئەو كاتەی كە ئەوەی لە ( ئەنفالی توركیانە) دا ڕوویدا و بێدەنگیی لێكرا، دەخەینەڕوو.

— ٤ —

دیارترین ئەو توێژینەوانەی كە گۆڤاری مانگانەی ( حوار العرب ) لە تەوەری ( كورد لە گێژەنی عەرەبدا )) بلاویكردۆتەوە، ئەو توێژینەوەیە بوو كە بیرمەندی لوبنانی (( نەسیم خوری )) بەناونیشانی (( كورد، یان دەوڵەتی مەحاڵ )) نوسیویەتی. لەم لێكۆڵینەوەیەدا (( خوری )) تێڕوانینی خۆی پێشكەش دەكات كە پوخت دەبێتەوە لەوەی كەوا مەسەلەی كورد وەك دۆزێكی دواخراو هەر لەپێش دەمێنێتەوە بەبێ لێكگەیشتن، یان دۆزینەوەی چارەسەرێكی كەمیش بێت بۆ دۆزە جوگرافییە ئاڵۆزەكانی وەكو كەركوك و، دۆزە سیاسییەكانی وەكو فیدراڵی، یان دۆزی كولتوری/ زمانی، لەگەڵیشیدا پاشەڕۆژی زمانی كوردی دەخاتەڕوو. (( خوری )) كتێبەكەی (( جۆناسان

رانـدلّ )) دەكاتــە گــەواهی و ئــەو بەشــەی كتێبەكــە كــە لەســەر كــورد نوسیوویەتی بەناونیشانی : (( وڵاتی هەزار شۆڕش و هەزار حەسرەت )) كە ئەویش وڵاتی كوردستانی سەرپاگیرە كە عیراق و ئێران و توركیا و سوریا دەگرێتەخۆ و لەحاڵەتی راپەڕینێكی هەمیشەییدا دەژین. بەڵام سەركەوتنی خـوازراو بەدەسـت نـاهێنن. حاڵیـشیان لەمـەدا وەك حـاڵی (( سـیزیف))ە لەئەفـسانەی یۆنانیــدا كــە تــاوێرە بــەردی لەســەر پــشت هەڵــدەگرت و سەردەكەوتە سەر بەرزایی شاخ و بەردەكە غلۆر دەبووەوە، پاشان زۆری پـیّ نەدەچــوو دادەبەزییــە خــوارەوەی شــاخەكە بــۆ ئــەوەی جــارێكی دی بەبەردەكەوە سەربكەوێتەوە.. ئیدی ئابەم شێوەیە ...

(( خوری )) لە لێكۆڵینەوەكەیدا دەڵێت : جوگرافیای سروشتی رۆڵێكی مێژوویی گرنگی لە پارچەپارچەكردنی كورد و پەرەوازەكردنیان بینیوە بەو جۆرەی كەلەمێژوودا روویداوە. دڵرەقیی جوگرافیا كە تێیدا دەژین دڵرەقیو مـەحاڵبوونی سروشـتییانەی ملكـەچ كردنیـان بـۆ ئەوانیـدی لا هێناونەتـە گۆڕێ، ئەوانیـدی كـە كوردیـان بەبۆنـەی رەتكردنـەوەیان بۆ ئـەوەی دەوڵـەتی تایبەتیی خۆیان هەبێت، نارەحـەتكردووە. هـەروەها ئـەو جوگرافیایـە هێزی جەربـەزەیی و ئازایـەتیی لەجەنگـدا لا هێناونەتـە كایـەوە. لـەو رووەوە كـورد دڵـسۆزییان بـۆ ئیـسلام نوانـدووەو جـەنگاوەری جەربـەزەیان پێـداوە. بـە سـەركردایەتیی سـەلاحەدین ئـەیوبی . ش رۆڵێكــی یەكلاكـەرەوەیان لــە بەرپەرچــدانەوەی خاچپەرســتەكاندا هــەبوو. رۆڵێكــی مێــژوویی ئـاینی و رۆشنبیریشیان هەبوو. زۆرێكیش لەناویاندا پێگەی ( شێخی ئیسلام )یان لە دەسەڵاتدریی عوسمانیدا بەدەستەوە گرت. تیاشیاندا شاعیر و رۆماننوس و نوسـەری هاوچـەرخ دەركـەوتن وەك بـۆ نموونـە : (( بلّنـد حەیـدەری، سـەلیم

بەرەکات، محەمەد کورد عەلی )) کە ئەدەبی نوێی عەرەبیان بەشێوەکی گەورە دەوڵەمەند کرد.

قسەمان پەیوەندارە بەشتی تریشەوە...

# هۆلۆکۆستی بەعسییانە

## ـ ١ ـ

بەر لە چەند رۆژێك ( ١٩٨٨/٣/١٦) یادی نۆزدە ساڵەی مەرگەساتی کورد، لە شاری هەڵەبجە، تێپەڕی، ئەو مەرگەساتەی کە لەمێژووی عەرەب و کورددا، وەکو یەك، بەئەندازەی هۆلۆکۆستێکی سامناك و کەم وێنە بوو. ئەو کوشتوبڕەی کە عەرەب لە ساڵی ١٩٨٨دا بە کوردیان کرد بەکەسی تریان نەکردوە. عەرەبە موسڵمانەکان لە مەدینەی منەوەرەدا جولەکەیان کوشتوبڕ کرد کە بە نەگبەتیی جولەکە ناسراوە، بەڵام ئەم کوشت و بڕە نەگەیشتە ئەو رادەیەی کە لەساڵی ١٩٨٨دا لە هەڵەبجە و ناوچە کوردییەکانیتردا پێی گەیشت. ئایدیۆلۆژیای نازییانەی بەعسیش رۆڵێکی گرنگی لەبەرز کردنەوەی ئاستی ئەو کوشتوبڕ و وەحشیەتگەرییەدا هەبوو. لەم رووەوە، مێژووی عەرەب وەك هەر گەلێکیتری سەر ئەم زەمینە، پێمان دەڵێ: تاوانێکی دوورودرێژمان لەکوشت وبڕکردنی دوژمنەکانمان

هەیە لەپێش ئیسلام و دوای ئیسلامیشدا. بەڵام ئیسلام بە ئامۆژگارییە بەخشندەکانی، زۆرجار، فاکتەرێکی گرنگ بووە لە بەمرۆڤانە نواندنی ئەو جەنگ و داگیرکاریيانەی کە عەرەب کردونیەتییە سەر گەلانیتری ئەم سەرزەمینە، بەڵام مێژوو رووداوگەلی کەم وێنە و وەحشیەتگەرانەی وەك ئەوەی تۆمارنەکردووە کە لەساڵی ١٩٨٨دا تۆماری کرد.

— ٢ —

لەسەر هۆڵۆکۆستی بەعس لەعیراق زۆرشت نوسرا ئیدی لە دژی کورد بووبێ یان شیعە و سوننە لە ئۆپۆزسیۆنی عیراقدا. دکتۆر جەواد هاشم-ی وەزیری نەخشەدانانی پێشووی عیراق کە لەحوکمی سەدام هەڵگەڕایەوە و پەنای بۆ کەنەدا برد، لە کتێبە گرنگەکەیدا ( مذكرات وزير عراقي مع البكر و صدام ١٩٦٧-٢٠٠٠) چیرۆکی ئەو مەرگەساتە بەکۆمەڵانە دەگێڕێتەوە کە ئەو حوکمە بەرپای نەکردبوون کە لەعیراقدا هەبوو بەڵکو چەتە حوکمڕانەکانی بەعس لە عیراقدا بەرپایان کردبوون. لەم رووەوە، لەعیراقدا حوکمڕانییەکی سیاسیی بوونی نەبوو، بەڵکو کۆمەڵێك چەتە حوکمڕانییان دەکرد، سەرۆکی ئەو چەتانەش سەدام حسێن بوو کە دەیان ساڵ بە لۆژیکی چەتە حوکمڕانیی عیراقی دەکرد نەك بەهیچ لۆژیکێکی ئەو رژێمە حوکمڕانە داپڵۆسێنەر و ستەمکارانەی کە مێژووی ئادەمیزاد بەخۆوەی بینیون. بەر لەچەتەیی بەعس لە عیراقدا، چەند شێواز و دەرکەوتێکی نازیزمییانە هەبوو - نازیزمییانە لە تاوانکاری و ستەمکاری و توندوتیژیی - یدا، لە ئەڵقەکانی ئەو لێکۆڵینەوەیەشدا کە ئێستا لە ئامادەکردنیدان ئاشنا دەبین بە (داپڵۆسین و سزا لە مێژووی بەعسیزم و نازیزم) و بەو نزیکانە

لەلاپەڕەکانی (ئیلاف) و ئامرازەکانی تری ڕاگەیاندندا دەست دەکەین بە بڵاوکردنەوەیان و ئینجا لە کتێبێکدا بەم ناونیشانەوە بڵاویان دەکەینەوە: چۆن بەعس لە عیراق و سوریا بەشێوەیەکی تایبەتی فقهی توندوتیژی و ستەمکارییان دامەزراند کە ئاسەوارەکانیان لەجیهانی عەرەبیدا تاوەکو ئێستاش ماون.

— ٢ —

عیراقییە ئازادیخوازەکان و لەو عیراقییە ئازادیخوازانەش عەبدولخالق حسێن دیمەنگەلێکی خێرامان لە هۆلۆکۆستی بەعس، کاتێک کە لەدەسەڵاتدا بوو، بۆ دەگێڕێتەوە. دەڵێ: حزبی بەعس لە دوای ئەوەی کە لەکودەتای ٨ ی شوبات ـ ی ١٩٦٣ حوکمی گرتەدەست تیرۆری دەسەڵاتی لەدژی گەل بەکارهێنا و نزیکەی ٢٠ هەزاری کەسی لەباشترین هاوڵاتییە عیراقییەکان لە دیموکراتەکان و چەپەکان کوشت و، گۆڕەپانەکانی یاریگا وەرزشییەکان و شەقامەکان و هۆڵی یانەکانی کرد بە گرتووخانە، چونکە زیندان و گرتووخانەکان پڕبیون و بەشی وەرگرتنی ئەو هەزاران کەسەیان نەدەکرد کە گیرابوون. عەبدولخالق حسێن بەردەوام دەبێ لە گێڕانەوەی دیمەکانی هۆلۆکۆستی بەعسییانە و دەڵێ: دوای ئەوەی کە بەعس بۆ جاری دووەم لە ساڵی ١٩٦٨ دەسەڵاتیان ئەتکرد، عیراقیان گۆڕی بۆ گەورەترین زیندان و گەورەترین گۆڕی بەکۆمەڵ بۆ قوربانیانی کارە تیرۆریستییەکانیان. ئەمە دوای ئەوەی کە سوودیان لەئەزموونی دۆڕاوی ساڵی ١٩٦٣ وەرگرت پاش ئەوەی کە عەبدولسەلام عارف-ی هاوپەیمانیان

کودەتـای بەسـەردا کـردن. لێـرەوە ئـەمجارەیان بڕیاریـدا بـە کەڵبـە و ددانەکانیان و بە نینۆکەکانیان و بەهەر نرخێك بێت دەسەلآت بپارێزن.

بە قسەی یەکێك لە شایەتحاڵەکانیش، کە ئەویش د. جواد هاشم-ی وەزیری نەخشەدانانی سەرەتای ئەوەدەکانی عیراقە، عەبدولخالق حسێن لەو کتێبەوە کە ناومان برد شایەتی بۆ ئەوە دەدات کە لەیەکێك لە کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی وەزیراندا سەدام حسێن لە قسەیەکیدا کە بۆ ئەوان کتوپڕبوو وتی: ئەزموونی ساڵی ١٩٦٣ چیدی دووبارە نابێتەوە، ئەمجارە حزبی بەعس هاتۆتە دەسەلآت بۆ ئەوەی حوکمڕانی بکات نەك بۆ ٣٠ ساڵ بەڵکو بۆ ٣٠٠ ساڵ، ئەمەش بەجێ ناهێنرێ تەنها بە تەرخانکردنی بودجەیەکی بەهێزی دارایی نەبێت بۆ حزب.

بۆیە لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیارێکی وەزاری بە خۆماڵیکردنی پشکێکی کۆلبەنکیان دەرکرا واتە ٥٪ ی نەوت و تەرخانکردنی بۆ دارایی حزب . بە پێی خەملاندنی د. جەواد هاشم-یش ئەو بڕە پارەیە لە ساڵی ١٩٩٠دا، لەگەڵ قازانجە کەڵەکەبووەکانی گەیشتە نزیکەی ٤٠ ملیار دۆلار.

— ٤ —

لەم یادەوەرییە ئازاردەرەدا هیچ قسەیەکی تازە نییە کە بوترێ تەنها دووبارەکردنەوەی ئەوە نەبێت کە بوترێ: کورد و عەرەبی شیعە و بەرهەڵستکاران لە عەرەبی سوننە جۆرەها ئازار و تاوانی ئەوتۆیان بینی و چەشت کە سەری مرۆڤ سپی دەکەن. ئەمە گرنگە، بەلآم گرنگتر لەوە ئەوەیە کە گەلی عیراق لەو دەمەوە ئیدی تۆمەتبار کرا بە توندوتیژی لەلایەك و، لەلایەکی تریش بەوەی گەلێکە حوکمڕانی ناکرێ تەنها بە ئاگر و ئاسن

نەبێت. ئەمەش هەڵەیەکی مێژوویی گەورەیە، چونکە ئەوەی ئایدیۆلۆژیای توندوتیژی و سزای لە مێژووی نوێی عیراقدا جێگیر کرد حزبی بەعس بوو، بگرە دەستەیەکی کەمبوون لەو تکریتییە بەعسییانەی کە دەسەڵاتیان بۆ خۆیان قۆرخ کرد، لەکاتێکدا کەزۆرینەی خەڵك لەدەرەوەی دەسەڵاتدا بوو. خوێندنەوەیەکی خێرا بۆ مێژووی عیراق و مێژووی گەلی عیراق، پێمان دەڵێن کە گەلی عیراق بە مۆرك گەلێکی ناسك و خاوەن خەونە و ژیانی خۆشدەویّ و رقی لە توندوتیژییەو سزاو داپڵۆسینیش رەت دەکاتەوە. هەر ئەم گەلەش بوو لەسەردەمی یەکەمی عەباسییەوە ( ٧٣٠- ٨٦١ز) تاوەکو ئێستا چاکترین شاعیرە رۆمانسییەکانی بۆ هێناینە کایە. لە سەردەمی نوێشدا باشترین شاعیرە مۆدێرنیستەکانی عەرەب لە عیراقدا دەرکەوتن کە لە نازك ئەلمەلائیکە ـ یەوە دەست پێدەکا و لە عەبدولقادر ئەلجەنابی کۆتایی پیّ دیّ کە بە پێشەنگی شاعیرە عەرەبە سوریالییەکان لەقەڵەم دەدەرێت. ولاتی شاعیرانیش هەمیشە ولاتی ئاشتی و خۆشویستن و خۆشەویستییە. کاتێك کە حزبی بەعسی نازیزست لەساڵی ١٩٦٣دا هاتە سەر حوکم، بە داپڵۆسین و سزاوە شاعیرە عیراقییەکانی کوشت و لە خاك و لەعیراق وەدەری نان و حزبی بەعس خۆی بووبە تاقە شاعیری عیراق. بەوەش عیراق وای لێهات شاعیرە راستەقینەکانی نەما، بەلام پر بوو لە جەلاد و بکوژی موتربەکراو بە ئایدیۆلۆژیا بەتایبەتی لەو دەمەوەی کە ساتع ئەلحەسری ( ابو خلدون) ئەو بەها عەرەبگەراییانەی پەخش کرد کە وەك زانراوە، لەرووی مێژووییەوە، لەبەهای بەنەڵمانیکردنی نەتەوەگەرانەی نازییانەوە سەرچاوە دەگرن، ئەمەش چیرۆکێکی دووروودرێژی هەیە و لێرەدا بواری باسکردنی نییە.

— ٥ —

ئەمڕۆ ئێمەی عەرەبە ڕۆشنبیرە لیبراڵیستەکان چی بە برایانی کورد بڵێین؟ کەمترین شتێك کە بوترێ ئەوەیە: ئێمە دەرهەقتان تاوانبار بووین. سەرەڕای ئەم تاوانە گەورە و چەپەڵە، کەچی ئێمە یەك وشەی داوای لێبوردن لە برایانی کوردمان لەهیچ بەرپرسێکی عەرەب یان موسڵمان یان عیراقی نەبیست.

ئەی خودایە لەم عەنجەهییەت و خۆبەزلزانینە پڕوپووچە کە لاف ئەوە دەدەین نەتەوەیەکی شارستانین و باشترین نەتەوەشین کە بۆ خەڵکی هاتبینە کایەوە ( خیر أمة اُخرجت للناس ) کەچی مەرجی ئەم هەڵبژاردنە خوداییە بۆ ئێمە فەرامۆش دەکەین کە ئەویش فەرمانە بە چاکە و نەفرەتکردنە لە خراپە. خراپەش لێرەدا مەیخواردن و دەستبازی لەگەڵ ژنان و دزی و درۆ و شتێتری نەفرەتلێکراوی لەم بابەتانە نییە، بەڵکو خراپە لێرەدا بێدەنگ بوونیشە لە هەق. پیاویش بە هەقەوە ئەناسرێ نەك هەق بە پیاوەوە بناسرێ. ئێمە زۆر زۆر لە هەق و ناهەق بێدەنگ بووین و هێشتاش هەر بێدەنگین.

هەتا ئێستا ڕۆشنبیرێکی گەورەی عەرەب، لە جێی چەتەکانی بەعس، داوای لێبووردنی لە کورد نەکردووە.

پێویستە هەموومان لەبەرەبەیانی ساڵیادی هەموو ساڵێکی هۆلۆکۆستی هەڵەبجەدا بە ڕووتی و پێی پەتی و پۆل پۆل لەبەردەم هەقیقەتی ئەوەی کە دەرهەق بە کوردمان کردووە، ڕابوەستین. ئەڵمانەکان لەسەر ئەوەی کە هیتلەر ـ ی نازی بە جولەکەی کرد، هەتا ئەو ڕۆژەی

زیندوونەکرینەوە هەر داوای لێبوردن لە جولەکە دەکەن. ئایا ئێمەی عەرەب دڵۆپێك لەو مرۆدۆستییە ئەڵمانی و ئاکارە ئەڵمانییەمان هەیە کە خاوەنی بەهاگەلێکی مرۆیی بەرزن؟ یان ئێمە هێشتا ڕیزی پیشەوەمان هەیە بەبێ ئەوەی زانامان هەبێ یان سەر بکەوین کە ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی بچینە گۆڕەوە؟

ئای چ نەتەوەیەکی جێی پێکەنین و سەرسەخت و زۆردار و خاوەن فیزی وشك–ین و خۆ ناسینی زۆرمان پێویستە.

# بۆ ئەوەی شالاوەکانی ئەنفال دووبارە نەبنەوە..

— ١ —

وەك چۆن ئەم مانگە، مانگی نیسان، رەوپێکردن و ئازادکردنی بەخۆوە بینی، رەوکردنی ملیۆنێك کورد لەپەرەوازەی سەرزەویدا و، ئازادکردنی گەلێك لەپەتی چەوسانەوەو زۆرداری ( مەبەست لەپرۆسەی ئازادیی عیراقە ـ وەرگێڕ)، ئاوهاش ئەم مانگە هەشت شالاوی شوومی ئەنفالی بەخۆوە بینی کەتائێستا، جگە لەشتی زۆرکەم و ئاسان، هیچیان لەبارەوە نەنوسراوە. ئەو شالاوانە زۆر گەورەتربوون لەو مێژووەی کە تائێستا لەبارەیانەوە تۆمار کراوە. ئەو شالاوانە پێویستیان بەگروپێکی گەورەش لەمێژوونووسان و رۆماننووسان و سینەماکاران و توێژەران هەیە بۆ ئەوەی لەوردەکاریی مەینەتییەکانیان و وردودرشتی کارەساتەکانیان ئاشنابین، چونکە شالاوەکانی ئەنفال چیدی مێژووی کورد بەتەنها خاوەنیان نییە، مێژووی

عـەرەبیش بەتـەنها خاوەنیـان نییـە، بـەڵکو بوونەتـە مـوڵکی میـژووی مرۆڤایـەتیش، مـاف تـەواوی مرۆڤایەتیشە کە بەباشترین شێوە بزانـێ چـی لەساڵی ۱۹۸۸دا روویـداوە کەوا نـاو لێنـراوە (( شاڵاوەکانی ئـەنفال)). وەك زانـراوە ئـەنفال لـەزمانی پیرۆزکـراودا (( دەسـکەوتی غـەزاکردنـە )). سـەدامی ستەمکار ـ ی دووڕوو ئـەم ناوەشـی بۆیـە لێنـا چـونکە کـورد ـ ی بـەدوژمنی خـۆی لەقەڵەم دا و، غەزاکردن و تـاڵانکردن و سـەرگەردانکردن و کوشـتنیانی وەك دەسکەوتی غەزاکردن دەبینی، غەزایەك کە شاعیرە گەورەکانی عەرەب و ئەستێرەکانی رۆشنبیریی داوەشیو و بێشەرمی عـەرەبی زۆریـان پیاهەڵداو، لـە (مەربـەد)ەکـانی شـعیرخوێندنەوەدا کەبەچـاودێری و دەسـت لەپـشتدانی سەدامی زۆرداری دووڕوو رێکدەخران، سروودیان بۆ دەووت.

**ـ ۲ ـ**

ئەنفالی سەدامییانەی بەعسییانەی نازییانە، بەتەنها یـەك شـاڵاو نـەبوو بـەڵکو هەشـت شـاڵاو بـوو، هەشـت شـاڵاو لـەماوەی سـاڵی ۱۹۸۸دا. ئـەم شـاڵاوانە لـەمانگی شـوباتەوە دەسـتیان پێکـرد و لـەمانگی ئـەیلولی هـەمان ساڵ، واتـە بەدرێـژایی شـەش مـانگ بـەردەوام بـوو و، تیایـدا دەسـەڵاتدارانی زۆردار هـەموو جـۆرە چـەکێکی تەقلیـدی و کیمیاوییـان بـەکارهێنا کەلەسـەر ئاسـتی نێودەوڵـەتی قەدەغـەکرابوون. دوو فەیلـەقی سـوپای عـیراق و هێـزە هەڵبـژاردەکانی گـاردی کۆمـاری و هێـزە تایبەتـەکان و مغـاویرو هێزەکـانی سوپای میللی و فەوجەکانی بەرگری نیشتمانی بەشدارییان تێدا کـرد. واتـە هەرچی ئەو دەسـەڵاتە تـەماعکارە هەیـەتی لەهێزی سـەربازی بـەکاری هێنـا، ئەویش بەفەرمانـدەیی عـەلی کیمیـایی ( عـەلی حەسـەن ئەلمەجیـد) کـە لـەو

شالاوانەدا لەوێنەی شەیتانێکی ڕەجمکراودا بوو، شەیتانێك کە لەوێنەی بوو.

شالاوە شوومەکانی ئەنفال لە ١٩٨٨/٢/٢٢ەوە بەشالاوی یەکەم دەستی پێکرد و بۆ ماوەی سێ هەفتە. بەدوایدا شالاوی دووەمی ئەنفال لەمانگی ئازار ڕوویدا و، دوای ئەوە شالاوی سێیەم لەمانگی نیسان و پاشان شالاوی چوارەم لە ٧ی ئایار و شالاوی پێنجەم و شەشەم و حەوتەم لە٢٤ی ئایارەوە تا ٢٦ی ئاب و شالاوی هەشتەم و کۆتاییش کە تا ٦ ی ئەیلول بەردەوام بوو. ئەمەش ئەو شالاوەیە کە بە(( مەرگەساتی گەورە )) ناونراوە. قوربانییەکانی ئەم شالاوانەش ٢٠٠٠ گوند بوون کە بەسەر ڕووی زەوییەوە نەهێلرا و، کوشتن و زیندەبەچالکردنی ١٨٠ هەزار کەسیش لەگۆڕە بەکۆمەڵەکاندا و ئاوارەکردنی ژمارەیەکی زۆریش. ئەو ژمارانەش نزیکەیین و جۆراوجۆرن و مێژوونوسانی کورد لەسەریانە کەژمارەی قوربانیان و زیانەکان بەشێوەیەکی کۆتایی و دیکۆمێنتکراو دیاری بکەن و یەکلایی بکەنەوە بۆ ئەوەی لەخەملاندن و مەزەندەی ئەو خەڵکە جیاجیانەدا نەمێننەوە کەدەیگێڕنەوە.

**— ٢ —**

لەم هەشت شالاوەدا هەموو چێنراو و زیندەوەرێك سوتێنران. سوتاندنی چێنراو و زیندەوەریش لێرەدا دەستەواژەیەکی ڕێژەیی — ی مەجازی نییە، بەڵکو دەستەواژەیەکە لەلایەن دەستەبژێرە کورد و ناکوردەکانیش گوزارش و لێکدانەوەی ورد و وردەکار دەهێنێتەوە گۆڕێ، چونکە لەکوردستانی عیراقدا دارستانەکان و گژوگیاکان و گوڵەکان

سوتێنران و خاك و زەویش سەرەوژێرکرا. هەموو زیندەوەرێکیش لەبابەت مـــرۆڤ و جنۆکـــەو ئـــاژەڵ کـــوژران؛ تەنانـــەت باڵنـــدەکانیش کـــوژران و، کوردستانی عیراقیش وەرچەرخا بۆ دەشتێکی تەخت، تەخت وەك ئەو خاکە وێرانەیەی کەشاعیر و رەخنەگری ئینگلیزی/ئەمریکی ( ت. ئیس. ئیلیوت) لەبارەیـەوە دووا. عـەلی کیمیـایی ـ ش کوردسـتانی بـەرەڵاکرد وەك چـۆن پێشتر یەزید بن معاویە مەدینە منەوەرە ـ ی بۆ ماوەی سێ رۆژ بەرەڵا کرد بۆ ئەوەی سەربازەکانی چییان بوێت تیایدا بیکەن، بگرە بەپێی گێڕانـەوەی تەبەری، یەزیـد زۆر لـە عەلی کیمیایی بەبەزەیی تر بووە بۆ چێنراوەکان و زیندەوەرەکان.

— ٤ —

ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە سـەرەڕای ئـەم دزێوییـە و ئـەم کـارە خراپانـە، کەچی بەعسییەکان و سەدامییەکان و هـەموو ئەوانـەی کە بەشـدارییان لـەو مەرگەساتە مرۆییەدا کرد، کەسیان چاو یان پێڵوی چاویان نەلەرزی، رۆژێك ویـژدانی یـەکێکیان بـەئاگا نـەهات کـە داوای لێبـووردن بکـات، یـان داوای بەخشین، یان پەشیمانبوونەوەی خۆی رابگەیـەنێت و داوای لێخۆشبوون و بەزەیی بکات، بەڵکو سەرە گەورەکەیان سەدام، کە فێری چۆنیەتی خواردنی گۆشتی سوری کاڵی کـردوون، لەبـەردەم کۆمـەڵێك لەکەسـانی حزبـی بـەعس راوەسـتا و– هـەروەك کـەناڵی ئاسمـانی ئەلعەرەبییـە کاسـێتەکەی پیشـاندا– وتـی: مـن ئامـادەم دەیـان هـەزار لەهاوولاتیان بکـوژم بـەبێ ئـەوەی یـەك تاڵـە مـوی لەشـم بلـەرزێت.. سـەدام–ی جـەلاد پێویـستیی بـەم لێدوانـەش نـەبوو، چونکە کەسی شمشێربەدەست کەسێکی بەختەوەرە، ئەو پێش ئەوەی ببێتە

شمشێربەدەست دڵی خۆی پەڕاندووە و فڕێداوەتە بەردەم سەگەکان تاوەکو رۆژێك لەرۆژان بە پەڕاندنی سەری خەڵك دڵتەنگ نەبێت. سەدام و هەموو ئەوانەش کە لەجەنگی لەنێوبردنی بەکۆمەڵدا لەساڵی ١٩٨٨ و لەساڵی ١٩٩١ لەدژی کورد و دژی شیعە و دژی سوننە بەتایبەتی بەرهەڵستکارەکانیان لەناوەوە و دەرەوەی عێراق، بەشداریبیان کرد، هەروایان کرد.

## ـ ٥ ـ

ئەوەی کە ئێستا گرنگە ئەوەیە: چی بکەین بۆ ئەوەی مەینەتییەکانی کارەساتی ١٩٨٨ و ١٩٩١ دووبارە نەبنەوە؟

سەدام حسێن دوا زۆردار نابێت کە لەجیهانی عەرەبیدا دەربکەوێت. جیهانی عەرەبی لەئێستا و رابردووشدا لەهەموو ناوچەکانی جیهان زیاتر زەمینەساز و ئامادەباشە بۆ دەرکەوتنی زۆرداران. بەڵگەش بۆ ئەوە ئەو لیستە دوورو درێژەیە لەزۆرداران کە چواردە سەدەیە بەقۆناغەکانی مێژووی عەرەبدا تێپەڕیون و جێ دەستی پیرۆزیان! بەجۆرێك بەجێهێشتووە کە لەناوهێنانیاندا دەستەواژەی پیرۆزکردن بخەینە دوایان ( خوا لێیان رازی بێت ) .. خاکی پیرۆزی عەرەبیش! لە بەپیتترین و چاکترین جۆرەکانی خاکە بۆ چاندنی دیکتاتۆری و زۆرداری. گەلی عەرەبیش لەهەموو گەلانی سەرزەمین عاشقترو پێشوازیکەرترو خووگرتووترو چێژوەرگرترو حەساوەترە بەحوکمی زۆرداران. هەر فەرمانڕەوایەکیش لەفەرمانڕەوایان دادپەروەر و خاوەن بەزەیی و سۆز و رەحم بووایە نازناوێکی ژنانەیان بەسەردا دادەبەری هەروەك خەڵکی شام لەسەروەختی عوسمانیدا وایان

لەگەڵ والی (( ئەسعەد پاشا عەزم ))دا کرد کە لەبەر سۆز و رەحم و بەزەییەکەی بە (( سەعدیە )) ناودەبرا. عەرەب، نواندنی ئەم عەشق و ئەم مردنەشی لەخۆشویستنی زۆرداردا تازەکردەوە بەتایبەتی لەو هەست و وەفا و دڵسۆزییەی کە بۆ دوا زۆرداری دەرکەوتووی ناو زۆردارەکانمانی پیشاندا، ئەمە بەجۆرێك دەبینین پەتی هەڵواسینی سەدامی زۆردار بۆتە بۆینباخ و سەدام خۆیشی بۆتە (( گەورەی شەهیدان )) و گەیشتۆتە کاروانی بەخشندەکانی ئالول بەیت.

هێشتا زۆردارگەلێك هەن کە حوکم دەکەن و، حزبی بەعسیش لەوێ هێشتا چاوەڕوانە، بزووتنەوەی ئیخوان موسلمین و حزبوڵلا و بزووتنەوەی حەماس و رێکخراوی قاعدە هەموویان لەوێ هێشتا چاوەڕوانی دامەزراندنی خەلافەتی دیکتاتۆریی ئاینین، چونکە ئەو دیکتاتۆرییەتە دڵڕەقانەی کە ئێستا لەگۆڕێدان بەس نین و دڵی ئەوانی پێ ئاو ناخواتەوە. تۆوی زۆرداری لەخاکی عەرەبدا هێشتا زۆرن و چاوەڕوانی تریشقەی کودەتا سەربازییەکان و گرمەی پارتە ئاینی و نەتەوەپەرستەکانن بۆ ئەوەی بازبدەن و لەسەر کورسییەکان دابنیشن، لەوێشەوە ئیتر ملیونەها قوڕگ بە گیانی خراپەخوازانە و خوێنی پیسەوە پێیاندا هەڵدەدەن.

چی بکەین بۆ ئەوەی هەبین بەبێ دووبارەبوونەوەی جارێکی تری دەرکەوتنی زۆرداران و بەبێ دووبارەبوونەوەی روودانی مەرگەساتی دیکە لەکوردستان و باشووری عیراق و حومات و لەهەموو جێیەکی جیهانی عەرەبی؟

پرسیارێکە زۆر زۆر ئاسانە. بەڵام وەڵامدانەوەی ئاسانترە، ئەویش ئەوەیە: هەر کاتێك کەخاوەنی ئیرادەیەکی بەهێزبووین. ئێمە هەموومان قسە لەسەر ئیرادە دەکەین و زۆری لەسەر دەڵێین، بەڵام خاوەنی نین.

# مانگی ڕەوپێکردن و ئازادکردن

— ١ —

لەهەموو ساڵێکدا، مانگی نیسان/ئەبریل مانگێکە لەگرنگترین مانگەکانی گەلی عیراق بەگشتی. ئەم مانگە جگەلەوەی مانگی بەهارە و گوڵەکان دەم دەکەنــەوە و باڵنــدەکان زۆردەبــن، مانگێکــە کــە ئــازار و برینــەکانیش بیردەخەنەوە. سەبارەت بەگەلی عیراق و هەموو ئازادیخوازانی جیهان، ئەم مانگــە بەبیرەوەرییــەکی ئازاربــەخش دادەنــرێ کەتیایــدا کــۆڕەوە ملیۆنییــە بەناوبانگەکەی ساڵی ١٩٩١ی گەلی خەباتگێڕی کورد ڕوودەدات.

لەلایــەکی تــرەوە، لەناوەڕاســتی ئــەم بــەهارەدا و هــەر لــەمانگی ئــەبریل/نیــساندا ڕژێمی زۆرداری پێشوو ڕوخــا، ئــەو ڕژێمــەی کــە هۆکــاری کۆڕەوی ملیۆنیی کورد بوو لەم مانگەدا. قەدەر واشی خواست کە تۆڵە لەم زۆردارە بکاتەوە، بۆیە هەر لەم مانگەشدا ڕماندی و حوکمی ستەمکارانەی ڕوخانــد لــەو مانگــەی کــەرژێمی زۆردار زیــاتر لــە یــەك ملیــۆن کــوردی بــۆ ســنورەکانی تورکیــا و ئێــران ڕاونــا، ئەمــەش بەمەبەســتی ڕەوپێکردنیــان لەعیراق و سڕینەوەی ئاسەواریان لەکوردستاندا.

**- ٢ -**

هیچ تایەفەیەکی عیراق، بە هەموو پۆلایی و ئازایەتییەکەوە بەرەنگاری حوکمی بەعسی زۆردار نەبووەوە لەسەروەختی سەدام حسێندا وەك ئەوەی کە کورد بەرەنگاری بووەوە. سەرەڕای هێزی سەربازی و پۆلیسی و ئەمنیی ئەم رژێمە، کورد لەساڵی ١٩٩١دا و لەداستانی بەناوبانگی کۆڕێ-دا کە لەنێوان پێشمەرگەکانی سەربە بەرەی کوردستانی و هێزەکانی رژێمی بەعسدا لەو ناوچەیە روویدا کەدەکەوێتە نێوان کۆڕێ و شەقلاوەو تائێستاش ئاسەوارەکانی ماون، پێشمەرگە توانی خراپترین شکست بەهێزەکانی رژێم بگەیەنێت و، فێریان بکات کەگرانە بتوانن ئیسقانی کورد بشکێنن، بەڵکو کورد هەر بەهێز و ئازایەتیی خۆیان بەئازادی و سەربەخۆیی خۆیان دەگەن، ئەمە جگە لەهاوسۆزیی کۆمەڵگا و رای گشتیی نێودەوڵەتی لەگەڵیاندا کە هەمووی لەگەڵ شەرعییەتی نێودەوڵەتیدا بوون، ئەو شەرعییەتەی کەخۆی لەنەتەوە یەکگرتووەکاندا دەبینییەوە لەو رۆژەی کەنەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری ٦٨٨ی خۆی دەرکرد بۆ ئەوەی دەستپێکی کۆمەڵێك لەبڕیارە رەواکان بێت بۆ پاراستنی کوردو هاریکاریکردن لەگەڵیاندا لەداخوازییان بۆ ئازادی و سەربەخۆییان و دامەزراندنی قەوارەی خۆیان وەك ئەوەی کەئێستا لەکوردستانی عیراقدا هەیە.

## ـ ٢ ـ

ئەوەی ئەو ئەدەبییاتە کەمەی خوێندبێتەوە کە لەسەر کۆڕەوە ملیۆنییە گەورەکەی سالّی ١٩٩١ نوسراوە، هیچی تری بۆ ناکرێ تەنها ئەوە نەبێت کەهاوسۆزی کوردبێ لەو کارەساتەی کەهەموو جیهان لەپێناویدا گریا وەك چۆن ئێستا بۆ ئەوە دەگری کە لە دارفۆر و فەلەستین و ناوەڕاست و باشوری عیراقیشدا رووددات. هەرچی میللەتی منە لەعەرەب و رۆشنبیران ئەوە تەماشاکەربوون و وەستابوون و جوڵەیان نەکرد دوای ئەوەی کە کۆبۆنەکانی نەوت، کە سەدام بۆی برِیبوونەوە، سەری کردبوون. ئەو کۆبۆنانەی کە رۆژنامەی ( ئەلمەدا) سالّی ٢٠٠٤ بلاّویکردنەوە و ریسوایکردن، کۆبۆنەکان کە درێژبووەوە بۆ سەرکردەی پارتە ناسیۆنالیستو ئاینییەکان و کەسایەتییە سیاسییەکان و نوسەران و رۆژنامەنووسان و پیاوانی کار و بازرگانان و ..هتد .. ئەوەش ئەو نرخە کەمەیە کە حوکمی سەدام حسێن دەیبەخشی بۆ ئەوەی زمانی خەڵکی پێ بێدەنگ بکا و عەقڵەکانی پێ لەکاربخا و ویژدانەکانی پێ بکڕێ، هەرواشی کرد.

لەو دەمەدا کە رای گشتیی عەرەبی و میدیای عەرەبی لەسەر پوچترین هۆکارو بێ بایەخترین رووداوە رادەوەستێت، زۆربەی رۆشنبیرانی عەرەب گوێی خۆیان کەڕ دەکردو چاوی خۆیان دادەخستو رووی خۆیان وەردەگێڕا تاوەکو ئەو کارەساتە مرۆییە قورسە نەبیستنو نەبینن کە لەژێر چاو و گوێی هەموو عەرەبدا لەباکوری عیراق روویدەدا. هەمووشمان لەبیرمانە کە چۆن ئیدوارد سەعید بەیاننامەی ناڕەزایی دەربڕینی لەسەر کاروکردەوە تۆقێنەرەکانی سەدام دراند و رەتی کردەوە کەئیمزای لەسەر

بکـات. ئـەوەش یـەکێك بـوو لەمەینەتییـەکانی ڕۆشـنبیریی عـەرەبی و ڕۆشـنبیرانی عـەرەب لـەو ماوەیـەوە و تائێستا. دەشێت هـەڵکردنی پـەڕۆی پرسـەنامەکان و بەتونـدی بەخۆداکێـشان و گریـانی هـستیرییانە کـەبۆ لەسێدارەدانی زۆرداری پێشوو سەدام حسێن کرا گەورەترین بەڵگەبێت کە عـەقڵی عـەرەبی تائێستا لەکارکـەوتووە و، ویـژدانی عـەرەبیش لای زۆرێـك لەڕۆشنبیرانی عەرەب هێشتا ئامادەگیی نییە و، سڕبووە بەزێڕی سـەدام و، دوای ئـەویش زێـڕی ڕەغـد-ی کـچی کەلەباوکییـەوە پـارەی دزراوی زۆری بـەمیرات بـۆ بـەجێماوە و خـەریکی ئەوەیـە هەڵیدەڕێژێتـە شـادەمارەکانی ڕۆشـنبیریی عـەرەبیی وشـکهەڵهاتووە وەك چـۆن هـەمان شـتی کـرد لـەکاتی دادگاییکردنی سەدامی زۆردار و دوای لەسێدارەدانیشی.

— ٤ —

کـۆڕەوی ملیـۆنیی کـورد لەسـاڵی ١٩٩١، لەمێـژووی کـوردی عێراقـدا داسـتانێکی مرۆیـی گەورەیـە. ئـەم داسـتانە پێویـستی بەخزمـەتکردنی ڕۆشنبیری و هونەریی گەورە هەیە. واتە ڕۆماننووسانی گەورەی کورد وەك سەلیم بەرەکات-ی شاعیر و ڕۆماننوسی کوردی سوریا کە تائێستا دەیـان ڕۆمانی بەناوبانگی نوسیوە و، هـەروەها ڕۆماننووسـانی کوردی عێراق وەك محەمەد موکری و خەسرەو جاف و فەرهاد پیرباڵ و دەیان ڕۆماننوسی تـری کـوردی عـێراق، هـەموو ئەوانـە داوای ئـەوەیان لێـدەکرێت کـە لەسـەر ئـەو داستانە کوردییە بوەستن کەخۆی لە کۆڕەوی ملیۆنیی ١٩٩١دا دەبینێتـەوە. هـــەروەها ئـــەرکی وەزارەتـــی ڕۆشـــنبیریی کـــوردی و وەزیـــرە چالاکەکەیەتی(فەلەکەدین کاکـەیی) کـە خـەڵاتێکی دارایـی بـاش دابنـێ بـۆ

رۆمانی سەرکەوتووی ئەو پێشبڕکێیەی کە بۆ ئەو مەبەستە رێك دەخرێت، ئەم کارە رۆماننوسانی کورد هاندەدات بۆ نوسین لەسەر ئەم داستانە مرۆییە گەورەیە. هەروەها ئەرکی وەزارەتی رۆشنبیری لەحکومەتی کوردی ئەوەیە کە پلان دابنێ بۆ بەرهەم هێنان و وێنەگرتنی پتر لە فیلمێکی سینەمایی جیهانی لەسەر ئەم داستانە و بانگێشتی گەورە دەرهێنەرانی جیهانیش بکات بۆ ئەو مەبەستە. باسەیر بکەین کە جولەکە چییان بەهۆلۆکۆستی نازی کردو چۆن لەپشت قۆزتنەوەی کارەساتەکانیان و وێناکردنیان لەرۆمان و سینەمادا توانیان قازانجێکی سیاسی و مێژوویی و رۆشنبیریی زۆرو زەوەند بەدەست بهێنن.

هەتا ئێستا فیلمی بەناوبانگی ( جارنامەی شندلەر) هەست و سۆزمان دەهەژێنێ و هەرگیز بیریش ناچێتەوە. کاریگەریی ئەو فیلمە لە دەیان کتێبی مێژوویی قوڵتربوو کە لەسەر هۆلۆکۆستی نازی نوسران، لەسەدان شیعری خەمهێنەریش کاریگەریی زۆرتر بوو کە شاعیران لەسەر هۆلۆکۆست - یان هۆنیوەتەوە. پێشم وایە ئەوەی کە لەکۆڕەوی ملیۆنیی ساڵی ١٩٩١دا روویدا زۆر لەوە خراپتربوو کە لەهۆلۆکۆستی نازیدا روویدا. ئەفسانەی هۆلۆکۆستی نازی ـ ش هیچ شتێك خزمەتی نەکردووە وەك ئەوەی کە سینەمای بونیادنراو لەسەر بنەمای رۆمانی هونەریی خزمەتی کردووە. بۆیە وەزیرە کاراکەی رۆشنبیری لە حکومەتی کوردستان لەسەریەتی کەبایەخی زۆر بەم مەسەلەیە بدات.

# دۆزی کورد لە فکری نوێی ئوردنیدا

— ١ —

دۆزی کورد بەئاستە عیراقی و ئیقلیمی و ئاستە گشتییەکەی کە تورکیا و ئێران و سوریا و ئەرمینیا دەگرێتەوە، بۆ رای گشتیی عەرەبی بەتەواوی ئاشنەکرابووەوە و هێشتاش شی نەکراوەتەوە. دەشێت هەر ئەمەش بێ بووبێتە هۆی بەدحاڵبوونێکی گەورە بۆ دۆزی کورد و بۆ دامەزرانی کوردستانی عیراق و پاشان کوردستانی گەورە، دوای ئازادبوونی نەتەوەیی لە تورکیا و ئێران و سوریا. هەر بۆیە ئێمە تێبینی گۆڕانێکی گرنگ دەکەین لە هەڵوێستە عەرەبییەکاندا بەتایبەتی لای رۆشنبیران و میدیاکاران کاتێك کەدۆزی کورد بەشێوەیەکی بابەتی و زانستی و هێمنانە شی دەکرێتەوە، هەروەك لەکۆڕی ( برایەتیی کوردی– عەرەبی، بۆ کوێ؟)بۆمان دەرکەوت کە ( منتدی الأردن الجدید ) سازیکرد کە سەکۆیەکی یالۆگئامێزی سەنتەری ئوردنی نوێیە بۆ لێکۆڵینەوە. لەو کۆڕەدا مامۆستا

سامی شۆڕش وەزیری رۆشنبیریی پێشووی هەرێمی کوردستان( ٢٠٠٤-٢٠٠٦) کـۆڕێکی گرنگـی گێـڕا. ئـەم کـۆڕە-ش کـە جـەماوەرێکی زۆر لەسیاسییەکان و میدیاکاران ئامادەی بوون هەرایەکی گەورەی وروژاند و پەرچەکرداری توندی بەدواداهات کە هەندێك لەو پەرچەکردارانە هەڵگری مۆرکی تۆمەتبارکردن بوون لەهەتیوەکانی سەدام حسێن ـ ەوە. لە کۆڕەکـەدا دەستەبژێرێك لـە سیاسـییەکان و رۆشـنبیران بەشـداربوون، لەوانـە: زەیـد حەمزە ـ ی وەزیری پێشووی تەندروستیی ئوردن کە لەپێجەمین فێستیڤاڵی مەدای رووناکبیری ـ یش لەهەولێر ئامادەبوو، وەدیع شەرایحە مامۆستای ئابووری لـە زانکـۆی ئـوردن، حـەمادە فەراعینـە رۆژنامـەنووس و ئەنـدامی پێشووی پەرلەمان، د. روحی شحالتوغ ئەندامی پەرلەمانی ئوردن، پارێزەر عەبـدولمونعیم ئـەلکوردی، مامۆسـتا حـازم مـەبیزین نوسـەر لەرۆژنامـەی (الـراي)، موسا ئەلموعایتـە سکرتێری گشتیی پارتی چەپی دیموکراسـی، هانی ئەلحورانی بەرێوەبەری سەنتەری ئوردنی نوێ بۆ لێکۆڵینـەوە و، حازم قەشوع سکرتێری گشتیی پارتی ریسالە ـ ی ئوردنی.

ـــ ٢ ـــ

گـرنگترین شـتێکیش کـە وەزیـری رۆشـنبیریی پێـشووی هـەرێمی کوردستانی عیراق سامی شۆڕش وتبێتی ئەوەبوو کە وتـی: کورد رۆڵێکـی بەرچـاویان لەنزیککردنـەوەی گۆشـەنیگای پێکهاتـە جیاوازەکـانی عیراقـدا گێڕاوە بۆ بەشداریکردن لەپرۆسەی سیاسـی و ئاشتبوونەوەی نیشتمانیدا، ئـەوەش لـەپێناوی پاڵنـانی بارودۆخـەکان لـەعیراق بـەرەو سـەقامگیری و جێگیری. هەروەها کورد رۆڵێکی گەورەیان لەسیاسەت و کاری دیبلۆماسی و

لەشەڕی بەکردەوە لەدژی ڕژێمی پێشوو گێڕاوە، ئامانجیشیان ئەوەبوو کە ئەم بەشدارییە لەکاری عیراقیی نیشتمانییانەدا ببێتە هۆی دامەزراندنی عیراقێکی دیموکراتیی پەرلەمانیی فیدراڵیی سەقامگیر، عیراقێك کە تیایدا هەموان مافی چوونیەك و باری ئارام و گیانی دڵنیاییان لەپاشەڕۆژ هەبێ و دوور لەجەنگ و ناکۆکییەکان و ڕق و قینەی تایەفەگەری و نەژادییە وێرانکەرەکان بن. شۆڕش ئەوەشی وت کە: " برایەتیی عەرەبی ـ کوردی، تەنها لەسەر هاوبەشیی سیاسیی دروست نەبووە، بەڵکو لەسەر رایەڵە کولتوری و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان و لەسەر بەرژەوەندیی هاوبەش و چارەنووسی هاوبەش و یەك نیشتمانیش دامەزراوە. برایەتیی کوردی ـ عەرەبی لەعیراق و دەرەوەی عیراقیش لەبەردەم تاقیکردنەوەیەکی قورسدایە و بگرە لەبەردەم چەند هەڕەشەیەکی گەورەدایە" بۆیە داوای کرد بەئارامگرتن و دیموکراسی و کرانەوە و گیانی سەردەم ڕووبەڕووی ئەو هەڕەشانەی ببنەوە. شۆڕش جەختی لەسەر پێویستیی ئەوەش کە لێپرسراوە عیراقییەکان گیانی ئاشتبوونەوە و مامەڵەکردنیان تێدابێ بەپێی سیاسەتێك کە ئامانجی لەخۆگرتنی هەموانی هەبێت لەچوارچێوەی حکومەتێکی بنکە فراواندا. شۆڕش بەراشکاوی ئەوەشی دوپاتکردەوە کە "بەردەوامبوونی درزەکان لەپەیوەندییەکانی عەرەبی ـ کوردیدا دەشێت ببێتە مایەی پەنابردنی کورد بۆ گەڕان بەدوای پەیوەندیی تردا، پەیوەندیی بەهێزتر لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپا و، پەیوەندیی لەگەڵ وڵاتانی تری ناوچەکەدا. کورد وەك حاڵی هەر گەلێکی دی پێویستیی بە فەزایەك لەپەیوەندییە تەندروستەکان و ئاڵوگۆڕی لێك گەیشتن هەیە، کاتێك کە کورد هەوای تەندروست لەناو نیشتمانەکەی خۆیاندا لەدەست دەدەن ئەوە هیچ هێزێك ناتوانێت لۆمەیان بکات بکات

لەسەر ئەوەی هەوڵبدەن سەربکێشنە دەرەوەی پەنجەرە بۆ ئەوەی هەوای پێویست بۆ بەردەوامبوونی ژیان هەڵمژن"..

## ـ ٢ ـ

مشتومڕێکی دوورودرێژ و توندیش لەم کۆڕەدا لەنێوان وەزیری رۆشنبیریی کورد و رووناکبیرە ئوردنییەکان دروستبوو، بەتایبەتی کە شەقامی ئوردنی لەلایەن پارتە ئاینی و ناسیۆنالیستە ئوردنییەکانەوە زۆر بەهێز لەدژی کورد هاندراون، ئەوەش لەئەنجامی پەیوەندیی پتەوی ئەم پارتانە بەرژێمی سەدام حسێنەوە و لەئەنجامی ئەوەش کە سەدام حسێن شەقامی ئوردنی و رای گشتیی ئوردنی و چالاکییە حزبی و سەندیکاییەکانی نوقمکردبوو بەبەخشش و دیارییەکان لەکۆبۆناتی نەوت و نەوتی بەلاش و لەو پارە زۆروزەوەندەش کەبەسەر سوودمەندانی ئەم پارت و سەندیکایانەو هەموو ئەو هێزانەدا دابەشی دەکردن کە رای گشتیی ئوردنییان پێك دەهێنا. بەڵام ئەو مشتومڕە لە کۆڕەکە لەدواییدا بووە مایەی تێگەیشتنێکی گەورەتر و قوڵتری دۆز و مەسەلەی کورد، کارێك کە پاڵی بەنوسەر و رۆژنامەنوسێکی گرنگی وەکو مەحمود ئەلریماوی ـ یەوە نا لەرۆژنامەی (الـرأي )، کە لەرۆژنامە گەورەکانی ئوردن و گرنگترینیانە، وتارێك بەناونیشانی ( شانسەکانی کوردی عیراق) بنوسێت و قسەیەکی بوێرانە بکات کە، پێش چەند ساڵێکی کەم، قورس بوو بوترێت کاتێك کە تەواوی شەقامی ئوردنی لەگەڵ سەدام حسێن بوو. ئەلریماوی لەوتارەکەیدا ئەوەی وتووە کە:" نهێنی نییە هەرێمی کوردستانی عیراق سوودمەندی یەکەمە ئەگەر تاقە سوودمەند نەبێ لەو گۆڕانکارییانەی کە لەو چوارساڵەدا لەناوچە

رووياندا. ئەویٚ ئارامترین و سەقامگیرترین ناوچەیە لەعیراق و بەکردەوە دۆخی دەوڵەتێکی سەربەخۆی هەیە". هەرچی پەیوەندیی بە کەرکوکەوە هەیە ئەلریماوی لەهەمان وتاریدا دەڵێت:" هەردوو حزبی حوکمڕان" پارتی دیموکرات و یەکێتیی نیشتمانی بانگەواز بۆ عیراقێکی دیموکراتیی یەکگرتوو و سیستمێکی فیدراڵی دەکەن کە ئەگەر سەرتاسەری عیراق نەگرێتەوە ئەوە دەبیٚ هەولێر و سلێمانی و دهۆك و کەرکوك بگرێتەوە بەو پێیەی کورد کەرکوك بەشاری خۆیان ئەزانن و پێیان وایە بەهۆی نیشتەجێکردنەوە لەسەردەمی رژێمی پێشوودا بەزۆرملیٚ بەعەرەبکراوە. بەکردەوەش کورد گەڕایەوە بۆ کەرکوك و ژمارەیەك لەدانیشتووانە عەرەبەکەی کەرکوکیش بەپارچەیەك زەویی نیشتەجێبوون و قەرەبوویەکی دارایی لەلایەن حکومەتی ناوەندییەوە قەرەبووکرانەوە، ئەوەش لەبەرامبەر ئەوەی شارەکە چۆڵ بکەن" ( رۆژنامەی ئەلرەئی ٥/٦/٢٠٠٧).

قسەی لەم جۆرەش لەنوسەرێکی رۆژنامەنوسیی ئوردنی لەیەکەمین رۆژنامەی ئوردندا بە کودەتایەکی گەورە دادەنرێت لەفکری ئوردنیدا و بەوەرچەرخانێکی بەرهەمهێنەریش بەلای هەق و راستیدا لەعیراق و بەتایبەتی لەکوردستان، بەتایبەتی کە مەحمود ئەلریماوی ناسراوە بەئاراستە ناسیۆنالیستییە دەمارگیرەکانی و بەوەی یەکێکە لەئەندامانی حزبی بەعس لەئوردن. هەروەها ئەو لەبنەماڵەی ئەلریماوی ـ شە کە ناسراوە بەلایەنگیریکردن لەحزبی بەعس بەرابەرایەتیی عەبدوڵڵا ئەلریماوی سکرتێری گشتیی پێشووی حزبی بەعس لەئوردن و، دامەزرێنەری رۆژنامەی ( البعث ) لەساڵی ١٩٥٨ و، یەکێك لەتیۆریزەکارانی ئەم حزبە و، دانەری کتێبی ( النظرية الثورية المعاصرة) و ( موسوعة الوعي العقائدي العربي)و( الموقف القومي)یش.

ئەم کۆڕە گرنگە شوێنەواری هەر لەسەر فکری سیاسیی ئوردنی و عەرەبی دانەنا، بەڵکو تێپەڕی بۆ ڕۆژئاوا و بەتایبەتیش بۆ ئیتاڵیا. لەم ڕووەوە، ئاژانسی ئاکی ـ ی ئیتاڵی بۆ هەواڵ چالاکییەکانی ئەم کۆڕەی گواستەوەو تواندجێکی پۆزەتیڤ و گرنگی لەسەری تۆمارکرد و وتی: ((زانراوە کە پەیوەندیی هەردوو گەلی عەرەب و کورد پەیوەندییەکی مێژوویی بەڵگەدارە، بەدرێژایی هەزار ساڵی رابردوو هاوپەیمانێتییەك لەنێوان هەردوو گەلدا دروستبووەو، کورد بەشداریی هەموو جەنگەکانی عەرەبیان کردووە بۆ بەرگرتن لەداگیرکەران بەتایبەتی لەماوەی جەنگەکانی خاچپەرستی کە تیایاندا سەلاحەدین ئەیوبی، کە کوردە، سەرکردایەتیی لایەنی عەرەبیی دەکرد و چەند ئیمارەتێکی عەرەبی دامەزران کە حوکمڕانانی کورد سەرداریان بوون، بەڵام ئەم پەیوەندییە گرفتی تێکەوت و لەدوای ڕێککەوتننامەی سایکس ـ بیکۆ وریایی و گومانی تێخزا، ئەو ڕێککەوتننامەیەی کە وڵاتانی شامی بۆ چەند دەوڵەتێکی بچووك دابەشکرد لەژێر پاسەوانیی بەریتانی و فەرنسی و کورد ـ ی لەدامەزراندنی دەوڵەتی خۆی بێبەش کرد، لەوکاتەشەوە کورد ئیش بۆ یەکخستنی وڵاتەکەیان دەکەن کە لەنێوان تورکیا و ئێران و عیراق و سوریا و یەکێتیی سۆڤێت دابەشکرا. عەرەبیش لەگەڵیاندا دەرفەتبەخش نەبوون و رازی نەبوون بەدامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لەو هەرێمە کوردییانەی کە دەکەونە وڵاتانی عەرەبییەوە..

هێشتا قسەش ماوە لەبارەی کۆڕی ( برایەتی عەرەبی – کوردی، بەرەو کوێ؟ )..

# بۆ رزگارکردنی عیراق، قەرەزاوی:
# ( پیاوە پێویستەکە)، هاوار بۆ کورد دەبا !

— ١ —

له مزگەوتی عومەر بن خەتاب-ەوە لە دەوحە، شێخ یوسف قەرەزاوی داوای لە سەرکردەکانی کورد و چالاکە سیاسییەکانیان کرد کە دەستی خێر بخەنە ناو ئەو ململانێ مەزهەبگەراییەی ئێستای نێوان سوننە و شیعەی عیراقەوە. بێگومان سەرکردەکانی کورد بیر لەم داخوازییە دەکەنەوەو تەماشاش دەکەن بزانن لەم بارەیەوە چییان لەدەست دێ بیکەن، ئەوان عاقڵیشن و دەتوانن ئەو کارە بکەن، بەڵگەی عەقڵانییەتیشیان ئەوەیە کە لە هەرێمی کوردستاندا کردوویانە لە ڕووی ڕێکخستنی باری ئاسایش و بڵاوکردنەوەی سەقامگیری و گەشەکردن و هاندانی وەبەرهێنان، بە جۆرێك کە بە عەقڵی پێشکەتنخواز و ڕەسەنی خۆیان توانیان جوانترین بەری ئەو ئازادییە بۆ خۆیان لێبکەنەوە کە لە بەرەبەیانی ٩ ی نیسانی ٢٠٠٣ دا ڕوویدا و، خۆیان نەگلاندە ململانێی سیاسی و مەزهەبییەوە وەك سوننە و شیعە لە ناوەڕاست و باشووردا خۆیان تێوەگلاند.

— ٢ —

بەڵام کۆمەڵێك پرسیاری زۆر هەیە کە ئێستا دەمانەوێ بیانخەینەڕوو:

– چی وای لە قەرەزاوی کرد ئێستاکە ئەو بانگەوازە ئاراستە بکات ؟

– ئەوە چۆن قەرەزاوی عەقڵی بڕی کەوا ئێستا لە عیراقدا گەلێك هەیە پێی ئەوترێ کورد لە کاتێکدا هەر خۆی بوو کە ئەم گەلەی پشت گوێ خست و بە درێژایی ساڵانی رابردوو لە چەوساندنەوەیان و کوشتنیان و وێرانکردنیان و راگوێزانیان بێدەنگ بوو بێ ئەوەی تەنها یەك وشەی هەق دەرهەق بەم گەلە بڵێ ؟

– کورد چۆن دەتوانن لە قەرەزاوی نزیك ببنەوە و بانگەوازەکەی جێبەجێ بکەن لە کاتێکدا ئەوە هەر قەرەزاوی بوو کە لە رابردوودا خەباتیان و ئازادییان و رزگارییان و سەربەخۆیانی بە ناوی ئیسلامەوە رەت دەکردەوە، ئەو ئیسلامەی کە ئەو و کۆمەڵێکی تر لە فیقهزانەکانی دەسەڵاتداران لەجیهانی عەرەبیدا، رفاندوویانەو لەبەرچاوانیان بزر کردووە.

– ئایا قەرەزاوی، لە کاتی شاڵاوە وەحشیگەرەکانی ئەنفالدا کە بە ئەندازەی هۆلۆکۆستی کوردە، بگرە توقێنەرتریشە لە هۆلۆکۆست، لە کوێ بوو؟

– بۆچی مزگەوتی عومەر بن خەتاب لە دەوحە لە ئاست ئەوەی کە سەدامی ستەمکاری لە گۆڕنراو ئەنجامیداو ئەوەش کە ( عەلی کیمیاوی) کردی کە ئێستا دادگایی دەکرێت، بە ئارەزاییەك نەجوڵا؟ چەند کەس وشەکانی دوێنێی قەرەزاوی ( پیاوە پێویستەکە) بزوانندنی کە هاوار بۆ کورد دەبا بۆ رزگارکردنی عیراق لە ململانێی خوێناویی سوننە و شیعەدا؟

## - ٣ -

داواکردن لە کوردە عاقڵەکان بۆ ئەوەی ئەو ململانێ و یەکترکوژییە مەزهەبییە گەوجەی لەنێوان هەردوو تایەفەی شیعە و سوونەی عەرەب بڕنەوە، خواستێکی ڕەوایە. پێشتریش ڕۆشنبیرە لیبراڵەکان داوای شتێکی وایان لە کورد کردبوو، ئەمەش بەو پێیەی کە کورد ئەو بەشە پێشەنگە عیراقییەن کە دەبێ دوویان بکەون. کورد نەکەوتنە ژێر کاریگەریتییە سیاسییە نەرەکییەکانیش: کاریگەریی ئێران و بە تایبەتی سوریا، بڕیاری نیشتمانی و سەروەرانەی تەندروست ـ ی خۆشیاندا و، هەرێمەکەی خۆیان، هەروەك پێشتر شیمان کردەوە، بە باشترین جۆری بونیادنان کە ئێستا بەدەست بێت لە عیراقدا، بونیادنا.

بەلام ئەم بانگەشەیە لەلایەن شێخ قەرەزاوییەوە( پیاوە پێویستەکە) بانگەشەیەکە، نامەوێ بڵێم بانگەشەیەکی ژەهراوییە ئەوەندەی کە بانگەشەیەکی هەقە و شتێکی پوچی لێ دەویسترێ. ئەو مەرامەیشی کە لێی ئاشکرا کراوە، گلاندنی کوردە لەو ململانێیەی کە ئێستا لە نێوان هەردوو تایەفەی شیعە و سوونەی عەرەبدا هەیە. پاشان ئەم بانگەشەیە جێی گومانەو، پێویست بوو ئاراستەی سوریا و ئێران کرایە پێش ئەوەی ئاراستەی کورد بکرێت، چونکە ئەوە ئەو دوو ڕژێمە بوون کە بەشێکی گەورەیان لە عیراق سوتاند و وێرانکرد کە خۆیشی ئەوەی هەڵدەگرت بەو جۆرە بسوتێت و وێران بێت، ئەمە لە کاتێکدا کە ئەو دوو ڕژێمە نەیانتوانی باکوری عیراق و هەرێمی کوردستان بسوتێنن و وێران بکەن، چونکە ئەم هەرێمە لە سوتاندن و وێرانکاریی سوری - ئێرانی یاخی بوو. هەروەها پێویستە ئەم بانگەشەیە ئاراستەی فیقهزانەکانی دەسەڵاتداران و

فیقهزانەکانی تیرۆر بکرێت، ئەوانەی کە بە فتوا یەك لە دوای یەکەکانیان شیعە و وسوننەیان لەسەر ئەو یەکترکوشتنە خوێناوییە گەوجانەیە هاندا.
ئەوەی کە درکیشی چاندووە لەسەریەتی هەر ئێستا بیدورێتەوە و داوای دورینەوەی لە خەڵکی دی نەکات.

— ٤ —

شێخ قەرەزاوی ( پیاوە پێویستەکە)، بەو پێیەی کە سەرۆکی یەکێتیی جیهانیی زانایانی موسڵمان ـ ە، بانگەواز بۆ کورد دەکا و داوایان لێ دەکات کە بۆ راگرتنی ئەو کوشت و کوشتارەی دەرهەق بە عیراقییەکان بەڕێوە دەچێت دەستی خێر وەربدەن و دەڵێ: ئەوەی لە عیراقدا روودەدات لەو کوشتارەی کە لەسەر شوناس هەیە، لەشی مرۆڤ گرژ دەکەن و سەریش سپی دەکەن. ئەمە لەکاتێکدا کە ئەوە هەر قەرەزاوی خۆی بوو، ئەو فەقیهەی تیرۆر بوو کە بە فتواکانی خوێنی کوردی حەڵاڵ دەکرد بە تایبەتی کاتێك کە لە سەندیکای رۆژنامەنووسان لە قاهیرەساڵی ٢٠٠٤ فتوا بەناوبانگەکەی دەرکرد، فتوای کوشتنی ئەمریکییەکان لەعیراق و هەر کەسێك کە هاوکارییان دەکات، ئاشکراشە کە ئەوە کورد بوو لە بەرژەوەندیی ئازادی و سەربەخۆیی و بونیادنانی هەرێمەکەیان، هاوکاریی ئەمریکییەکانیان کرد.
ئەوە هەر قەرەزاوی-یش بوو کە بێدەنگ بوو لە هەموو تاوانەکانی سوننە لەکوردستان یان لە هەر شوێنێك لە شوێنەکانی عیراقدا لە ساڵی ٢٠٠٣ەوە تا ئەمڕۆ. کاتێکیش کە تاوانبارە تیرۆریستەکان، کە قەرەزاوی جارێك پێیان دەڵێ:( موجاهیدەکان) و جارێك پێیان دەڵێ:(بەرەنگاریکاران/ المقاومون)، چەند شوێنێکی کوردستانیان تەقاندەوەو لە شایی و

ئاهەنگەکانـدا ژن و منـداڵ و پیرەمێـردو خـەڵکی بـێ گوناهیـان کوشـت، قـەرەزاوی لـەجێی خـۆی جوڵـەی نـەکردو فتوایـەکی دەرنـەکرد ئـەم تاوانانـە سەرزەنـشت بکـا و، خۆپیـشاندانێکی گەورەشـی بـەڕێوە نـەبرد وەك ئـەو خۆپیـــشاندانەی کـــە لـــەکاتی هێرشـــکردنی تیرۆریـــستاندا بـــۆ ســـەر قوتابخانەیەکی منداڵان لە دەوحە، بەڕێوەی برد.

قـەرەزاوی حـاڵی وەك حـاڵی ئـەودوای پیـاوە گـەورەکانی دامـەزراوەی ئاینییـە لـە سەرتاسـەری وڵاتـانی عەرەبیـدا و، دێـت و بـە دوو تـەرازوو نـا، بەڵکو بە هەزار کۆت و بەند و تەرازوو شتەکان کێشانە و پێوانە دەکا.

## ـ ٥ ـ

لـەم رۆژگارەمانـدا پیـاوە دیارەکـانی ئـاین وا رێـچکەیان گرتـووە کـە بـە گـوێرەی ئـەوەی خۆیـان دەیانـەوێت و ئامانجیانـە مانـا بـە تێکـستی ئـاینی ببەخشن. لەم رووەوە، شێخ قەرەزاوی لە سەردەمی سەدام حسێن-دا دەمی قورئـانی نـەکردەوە و ئـەو هاندانانـەی تیـا نـەبینین کـە لەسـەر سـووکایەتی نـــەکردنن بـــە ئـــابڕوی مـــرۆڤ و ئـــابڕوی موســـڵمان و نەچەوســـاندنەوەی و خراپەنەکردن دەرهەقی. ئەو، واتە قەرەزاوی، چاوی خۆی نوقاند و هـەویری تەپاندە گوێچکەیەکییەوە و قوڕ-یش بە گوێچکەکەی دیکەی تاوەکو دەنگی هاواری چەوساوە و ئازاردراوەکان نەبیستێت و، ئەوە نەبینێت کـە سـەدامی ستەمکار بە کوردی کرد لـە باکوری عێراق و دەرەوەی عێراقیش. هەرچـی ئەمڕۆیە، دەبینین قەرەزاوی دەمی قورئان دەکاتەوە و لە دەقە پیرۆزەکانمـان بەسـەردا دەخوێنێـت لـەو دەقانـەی کـە سـوود بـەو دۆز و مەسـەلەیەی ئـەو

دەگەیەنن کە ئێستا لە عیراق بەرگریی لێدەکات نەك ئەوەی کە دەشیا سوود بە دۆز و مەینەتی و کارەساتەکانی کورد بگەیەنێت.

## ـ ٦ ـ

قەرەزاوی ( پیاوە پێویستەکە) و خەڵکانی تریش لە پیاوە دیارە فیقهزانەکانی دەسەڵاتداران، لە ڕووبەڕووبوونەوەیاندا بۆ ڕووداوە سیاسییەکان ڕێبازێکی گوڵبژێرییانە ( إنتقائي )پەیڕەو دەکەن. ئەوان داری ئاین بەکاردێنن بۆ دەست خستنە ناقڕەی سیاسەتەوە، ڕێبازی گوڵبژێرییشیان لەسەر هەڵبژاردنی ئەو دەقانە دەوەستێت کە لەبەرژەوەندییانە و خزمەت بە مەرامەکانیان و مەرامە سیاسییەکانی دەسەڵاتداران دەکات. حەسە حەنەفی لە کتێبی ( مشايخ السلطان ) دا ڕەخنە لەو پیاوە ئاینییانە دەگرێت کە دەمی قورئان و کتێبی فەرموودەکانی پێغەمبەر دەکەنەوە و ئەو شتە گوڵبژێر دەکەن کە خۆیان دەیانەوێت و، لەگەڵ چێشتی ئەو ڕۆژەیان و چێژی فلانە دەسەڵاتداردا دەگونجێت. ئەو دەڵێ: دوای بڕیارەکانی کۆنگرەی خەرتوم ـ ی پاش نوشستی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٧ و هەرسێ (نا)کە، نا بۆ ڕێککەوتن، نا بۆ دانوستان، نا بۆ داننان بە ئیسرائیل، فوقەهای دەسەڵات بە فتوا و دەقە ئاینییەکان دەستیانکرد بە پاساو هێنانەوە بۆ ئەم سێ ( نا)یە: ( و أعدو لهم ما أستطعتم من قوة و من رباط الخيل )، ( و جاهدوا في الله حق جهاده)، ( اذن للذين يقاتلون بأنهم ظلموا وأن الله على نصرهم لقدير )، ( و قاتلوا اللذين يقاتلونكم ) لەگەڵ زۆر ئایەت و فەرموودەی تری لەم بابەتە .. کاتێکیش کە کۆماری دووەمی میسر لە کۆماری یەکەم هەڵگەڕایەوە و ڕێککەوتنامەی

کامب دێڤید لە ساڵی ١٩٧٨ و پەیماننامەی ئاشتی لەنێوان میسرو ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٧٩دا مۆرکرا، خودی فوقەهاکانی دەسەڵاتداران خۆیان بە ئایاتو فەرموودەی تر پاساویان بۆ بڕیارەکانی دەسەڵاتداران هێنایەوە : ( و إن جنحوا للسلم فاجنح لها ) ، ( ادخلوا في السلم كافة ) ئاشتی و شالۆم-یش لەیەك شت پێکهاتوون و هەردووکیان کوڕە مامی یەکترین لە نەوەی ئیبراهیم . لەسەر ئاستی ناوخۆ-ش هەمان وەرچەرخان روویدا، وەرچەرخان لە فکری سۆشیالیزم و ناسیۆنالیزم و بێ لایەنی ( عدم الإنحیاز )ەوە، کە ئەمە هەڵبژاردەی-ی کۆماری یەکەم بوو، بۆ سەرمایەداری و هەرێمایەتی و لایەنگیریکردن بۆ ئەمریکا و ئیسرائیل کە ئەمەش کودەتای کۆماری دووەمە کە هێشتا لە کۆماری سێیەم وکۆتایی ـ ی سەردەمێك لەمێژووی هاوچەرخی میسردا لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستدا، بەردەوامە. لەم رووەوە، فوقەهای دەسەڵاتداران لە کۆماری یەکەم فتوای ئەوەیاندا کە ئیسلام ئاینی سۆشیالیزمە و، فەرموودەیەکی پێغەمبەریشیان بۆ ئەوە هێنایەوە : ( الناس شركاء في ثلاث: الماء الكلأ و النار ). وتیشیان خاتوو خەدیجە-ی خێزانی پێغەمبەر، دایکی سۆشیالیستەکان بووە، دیارە چەند کتێبێکیش لەو بوارەدا دەرچووە، هەروەها ئەوان ئەوەشیان وت کە کەرتی گشتی لە ئیسلام-ەوەیە هەروەك دیاردەی ( باج و لێبڕین) بەرجەستەی کردووە، ئەو باج و لێبڕینەش ئەوەیە کە خەلیفەکان بۆ بەرژەوەندیی گشتی لە خەڵکی وەردەگرن و لێیان دەبڕن وەك تەرخانکردنی لەوەڕگاکان بۆ حوشترـ ی خەڵکی، لەمەشەوە دەڵێن ( ليس منا من بات جوعان و جاره طاو)؛ ( و الذين في أموالهم حق معلوم للسائل و المحروم).

کاتێکیش کە کودەتا لە کۆماری دووەمدا روویدا؛ فوقەهاکانی دەسەڵاتداران دەستیان کرد بە پاساودانی سیاسەتی کرانەوە و رەخنەگرتن

له شیوعییه‌تی بیٚ باوەڕ و وتیان ( ئەوەی باوەڕی نەهێنابیٚ جێی متمانە نییە ) کاسبیی ئازاد-یش کارێکی ڕەوایە، بازرگانیش لە بازاڕەکاندا حەڵاڵە، بە پشت بەستنیش بە خوا ئەوە بازرگانی پیس و بیٚ خێر نابێت. هەرچییەکیش کە دەستی مرۆڤ بکەوێت ئەوە رزقی ئەوە جا ئیتر، بە پشت بەستن بە رای هەندیٚ لە خەڵکانی زەمانی زوو، ئەو رزقە حەڵاڵ بێت یان حەرام. خۆشگوزەرانی-یش مافێکە لە مافی باوەڕداران ( قل من حرم زینة الله و الطیبات من الرزق قل هي للذین آمنوا ). ڕۆژئاوا-ش باوەڕدارە و ڕۆژهەڵات کافر. لایەنگیریکردنی ڕۆژئاوای باوەڕداریش لە دژی ڕۆژهەڵاتی کافر چاکە و بەرەکەتە و سەرخستنی ئیسلام و موسڵمانانە. سەرگەورەی شێخانی دەسەڵاتدارانیش بۆ هاندانی خەڵکی لەسەر بەشداریکردن لە دەنگدان بۆ گۆڕینی ماددەی ٧٨ لە دەستوور و بایکۆت نەکردنی هەروەك ئۆپۆزسیۆن دەیەوێت بە هەمان جۆر فتوایەکی دەرکرد ( و لا تکتموا الشهادة و من یکتمها فإنه آثم قلبه ). سا ئیتر چۆن دەتانەوێت باوەڕ بە بانگەشەی ئەو پیاوە ئاینییانە بکەین، ئەوانەی کە ئاینیان لەبەرچاو بزرکردو دەقە پیرۆزەکانیشیان کردۆتە لاستیکێك بۆ خۆیان.

# بەئاگاهاتنەوە لە مەسەلەی کورد

**ـ ١ ـ**

کتێبی ( بەئاگاهاتنەوە )ی تۆفیق ئەلحەکیم کە لەساڵی ١٩٧٢ دا دوای کۆچی دوایی عەبدولناسر دەریکرد و بەتوندی هێرشی کردبووەسەر، لەگرنگترین کتێبەکانی ئەلحەکیم-ە کە کاریگەریی گەورەی لەسەر فکری سیاسیی میسری، هەبوو. ئەم کتێبە هەرایەکی میدیایی و سیاسی و مێژوویی گەورەی لەمیسردا نایەوە. ئەلحەکیم لەم کتێبەدا هەڵوێستی خۆی لەئەزموونی ناسرییەت، کە لە ١٩٥٢ەوە دەستیپێکرد و لە١٩٧٣دا کۆتایی هات، کورت کردۆتەوە بەوەی وەها باسی لەو قۆناغە کردووە کە قۆناغێك بووە گەلی میسر تیایدا هۆشیاریی لەدەست دابوو. ئەم قۆناغە رێی بەدەرکەوتنی بیروڕایەك بەئاشکرایی نەدەدا کە لەبیروڕای رابەری پەرستراو جیاوازبێت. ئەلحەکیم لەم کتێبەیدا ئەوەشی راگەیاند کە هەڵەی کردووە لەوەی بەبێ ئاگایی دوای شۆڕش کەوتووە، لەم بارەیەشەوە دەڵێ: (( سەیر لەوەدایە کەسێکی وەکو من کە لەسەر خەڵکی ئەم وڵاتە و بە پیاوی بیرمەند حسابکراوە و لەهەڵکشانی تەمەنیدا تووشی شۆڕش بووە، بتوانرێ بەدوای کەفوکوڵێکی سۆزدارانەشدا کێش بکرێت و، ئەوە بەخەیاڵمدا نەیەت بیر لە

راستیی ئەو وێنەیە بکەمەوە کە بۆمان دروست دەکرا. وادیاربوو متمانە بیرکردنەوەی ئیفلیج کردبوو. بەبریسکەی هیواگەلێك سحریان لێکردبووین کە ئێمە لەمێژبوو خەونمان پێوەدەبینین، بە مەی- ی دەسکەوت و سەروەرییەکانیش مەستیان کردبووین، مەستببووین هەتا ئاگامان لەخۆ نەما. دیارە لەسەر ئەم جۆرەی ژیانیش کە تیایدا شۆڕش کردبوونی بەتەنها نامێری پێشوازیکردن، ڕاهاتین. نازانم چۆن کەسێکی وەکو من توانی ئەوە ببینێ و ببیستێ و ئەوەی بینی و بیستی زۆر کاری تێنە نەکات و بەهەست و سۆزی باشی خۆی لەئاست جەمال عەبدولناسردا، بمێنێتەوە. ئایا ئەوە لەدەستدانی ئاگاییە؟ یان ئەوە حاڵەتێکی نامۆی بێهۆشکردنە؟)).

بەم دان پیانانە کەدەنگی دایەوە و، بەم ووشانە، تۆفیق ئەلحەکیم کتێبە متمانەبەخشەکەی ( بەئاگاهاتنەوە) پوخت کردەوە.

ئایا پەیوەندیی ئەم کتێبە بە وتاری ئەمڕۆمانەوە چییە ؟

— ٢ —

ئەو هۆشیارییە بە هەقیقەتی حوکمڕانی ناسری، یان بەوەی ناوی ناسرییەت-ی لێنرا، کە دوای نزیکەی بیست ساڵ لەحوکمی دیکتاتۆریی ناسری. بۆ تۆفیق ئەلحەکیم گەڕایەوە، ئەو هۆشیارییەیە کە دوای ٣٠ ساڵ لەحوکمی سەدام حسێن - ی دیکتاتۆر خەریکە بۆ ڕۆشنبیرانی عەرەب بەگشتی و ڕۆشنبیرانی ئوردنی بەتایبەتی، دەگەڕێتەوە. کەواتە دەبێ هۆشیاری هەر بگەڕێتەوە ئەگەر هەندێ جار ئامادەگیشی درێژە بکێشێت. هەر ئەمەش بوو کە بەروونی لەمیانەی کۆڕی ( برایەتیی عەرەبی - کوردی بۆ کوێ؟ ) دەرکەوت کە (منتدی الأردن الجدید) سازیکرد، ئەم مونتەدایە

(سـەكۆیەكی دیالۆگئـامێزی سـەنتەری ئـوردنی نوێیـە بـۆ لێكۆڵینـەوە )و مامۆستا سامی شۆڕش وەزیری پێشووی رۆشنبیریی هەرێمی كوردستانی عـێراق (٢٠٠٤ – ٢٠٠٦) كـۆڕێكی گرنگـی تێـدا بەسـت، كۆڕەكـەش كـە كۆمەڵێكی زۆر لەسیاسی و میدیاییەكان ئامادەی بوون هەرایەكی گەورەی نایەوە و پەرچەكردارگەلێكی توندی بەدوادا هات، بەڵام گرنگترین شتێك لەم كۆڕەدا ئەوەیە كە، یەكەمین موژدەی بەئاگاهاتنەوە بوو بۆ فكری سیاسیی عەرەبی بەگشتی و فكری سیاسیی ئوردنی بەتایبەتی لەبارەی مەسەلەی كوردەوە. ئەمەش دوای ئەو پشتگوێخستن و نكۆڵی لێكردن و گوێپێنەدانە بوو بەرامبەر بە دۆزی ناوەندیی كورد لـەعێراق و دەرەوەی عێراق لەلایـەن رۆشـنبیرە ناسیۆنالیـست و ئاینییـەكانی عـەرەب بەگـشتی و رۆشـنبیرە ئوردنییـەكان بەتایبـەتی: بەدرێـژایی حـوكمی دیكتـاتۆریی سـەدام حسێن و لەئـەنجامی كەوتنـە دوای كـەفوكوڵی سـۆزدارانەی نەتـەوەیی و ئـاینی و متمانەی كوێرانەیان بەرژێمی دیكتاتۆریی سەدام، متمانەیەك كەبووە هۆی ئیفلیجكردنی بیركردنەوەیان، بیركردنەوەی ئەوانەی بەبریسكەی هیواگەلێك سـحریان لێكردبـوون كـە لەمێـژبوو خـەونیان پێـوەدەبینی، بـە مـەی- ی دەسـكەوت و سـەروەرییەكانیش مەسـت ببـوون، مەستببوون هـەتا ئاگایـان لەخۆ نـەما، بـەڵام ئـەوە متمانـەكردن بـە حـوكمی دیكتـاتۆریی سـەدام نـەبوو بەتـەنها كـە هۆكـاری ئـەو هـەموو كوێرایيـەبێت لەئاست هەقیقەتی واقیعی دیكتاتۆریيانەی سەردەمی سەدام، مەستبوون بەمەی -ی دەسكەوتەكان و سەروەرییەكانیش هۆكاری نائامادەگیی ئـەم هـەموو ئاگاییـەی ئـەو كەسـانە نـەبوو، چونكە سـەردەمی سـەدام دەسكەوت و سـەروەرییەكی تیـادا نـەبوو ئەوەندەی كە زیان و كارەسات و تاوانی هەبوو، بەڵام ئـەوە بریـسكەی زێـڕی سەدام بوو، كە عەبدولناسر هیچی لەوەی نەبوو بۆ ئەوەی چاوانی رۆشنبیرە

میسرییەکانی پێ بنوقێنێ، کە چاو و چاوکراوەیی ڕۆشنبیرانی عەرەب و ڕۆشنبیرە ئوردنییەکانی بەتایبەتی لەهەقیقەتی واقعی دیکتاتۆری و ئەو تاوانە قێزەوەنانە کوێر کرد کە سەدام دەرهەق بەکورد و غەیری کورد کردنـــی دوای ئـــەوەی کـــە ســـەدام ناوچـــەیەکی نیـــشتەجێکردنی ڕۆژنامەنووسان-ی بۆ ڕۆژنامەنووسە ئوردنییەکان بونیادنا و ئوتۆمبیلی مەرسیدس و کورسی خوێندن و بەخشش و ئیمتیازاتی جیاجیای بەسەردا باراندن.

ئەمرۆش ئەم ئاگاییەیان بۆ دەگەڕێتەوە دوای ئەوەی کە ئەفسون ( سحر) ڕەوییەوە، ئەفسونیش لە ئەفسونباز هەڵگەڕایەوە، کاریگەری بریسکەی زێڕ و ئاڵتونیش نەماو هیچ لەم بریسکەیە نەما جگە لە بریسکەی زێڕی ڕەغد ـ ی سەدام حسێن کە دەڵێن هێشتا کاریگەری لە ناوەندەکانی هەندێ لە ڕۆشنبیرە ئوردنییەکاندا ماوە، لەوانەیان کە لەڕۆژی لەسێدارەدانی سەدام-ی ستەمکاردا لەخۆیان دەدا.

— ٢ —

کەواتە، ئایا نیشانەکانی بەئاگاهاتنەوە بە مەسەلەی کورد لای ڕۆشنبیرە ئوردنییەکان، ئەو ڕۆشنبیرانەی کە هەندێ لەخەڵوەتی خۆیان بەئاگاهاتنەوە چین؟، کاتێك گوێبیستی موحازەرەکەی سامی شۆڕش وەزیری پێشووی ڕۆشنبیری هەرێمی کوردستان بوون.

لەو نیشانانە: :

١- بایەخدانی گەورەی ڕۆشنبیرە ئوردنییەکان و میدیای ئوردنی بەم کۆڕە لە ڕووی زۆریی ئامادەبوون و جۆراوجۆرییان و نوسینی سەرنج لەبارەیەوە لە میدیای ئوردونی.

٢- سازکردنی گفتوگۆی برایانە لەم کۆڕەدا لەبارەی پەیوەندیی هەردوو گەلی عەرەب و کورد لەنێوان لایەنە جیاجیاکانی رۆشنبیرانی ئوردنداو جەختکردنەوەیان لەسەر ئەوەی کە ئەم پەیوەندییە پەیوەندییەکی مێژوویی متمانەپێکراوە. لەو رووەوە هاوپەیمانێتییەك بەدرێژایی هەزار ساڵی رابردوو لەنێوان هەردوو گەلدا دامەزرا و، گەلی کورد بەشداریی لەهەموو جەنگە عەرەبییەکاندا کرد بۆ بەرگرتن لە داگیرکەران. بەڵام ئەم پەیوەندییە گرفتی تێکەوت و وریایی و گومانی گرتەخۆ دوای رێککەوتننامەی سایکس - بیکۆ کە وڵاتی شام - ی بۆ چەند دەوڵەتێکی بچووك لەژێر پاسەوانی بەریتانیا و فەرەنسا دابەشکرد و کورد - ی لەدامەزراندنی دەوڵەتی خۆیان بێبەشکرد. هەر لەو کاتەشەوە کورد ئیش بۆ یەکخستنی وڵاتەکەیان دەکەن کە بەسەر تورکیا و ئێران و عیراق و سوریا و یەکێتیی شورەویدا دابەشکرا، بەڵام کورد لەهەرێمی کوردستانی عیراقدا بەئارامگرتن و پێداگیریی خۆیان توانیان دوای تێکۆشانێکی دوورودرێژ دەسکەوتی باش بەدەست بهێنن کە خۆیان لە فیدراڵیدا دەبیننەوە.

٣ - کاریگەریی پۆزەتیڤی ئەم کۆڕە کاریگەریی هەر لەسەر رۆژنامەگەریی ئوردنی دانەنا، بەڵکو لەوە تێپەڕی بۆ رۆژنامەگەریی عەرەبی-ش کە نەیار و دوژمنی مافی کورد بوون لەوەی دەوڵەتی خۆی دابمەزرێنێت، وەك چۆن پشتگیریی سەردەمی سەدام-یان دەکرد و هێشتاش دەیکەن وەك رۆژنامەی ( القدس العربي ) کە لەلەندەن دەردەچێت. تارق ئەلفاید - ی پەیامنێری ئەم رۆژنامەیە لەعەممان پەیامێکی بۆ رۆژنامەکە ناردووەو بڵاوی کردۆتەوەو تیایدا دەڵێت: لەدانیشتنێکی دیالۆگئامێزدا بەناونیشانی ( برایەتیی عەرەبی - کوردی بۆ کوێ ) کە ژمارەیەکی زۆر لە رۆشنبیران و دیبلۆماتکاران و هەندێ لەحزبە ئوردنییەکان

ئامـادەیبوون، سـامی شـۆڕش وەزیـری پێـشووی رۆشـنبیریی هـەرێمی کوردستان وتـی: کوردەکـان ئێستا دەتـوانن لـەماوەی ٢٤ سـەعاتدا دەست بەسەر شاری ئابووری ـ ی کەرکوکدا بگرن، واشی لەقەڵەمدا کە لەمێژە ماق خۆیان لەم شارەدا هەیە. ژمارەیـەکی زۆر لەئامادەبووانیش پشتگیرییان لە داواکاریی کورد کرد بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی خاوەن سنوری سیاسی لە کوردستانی عیراق.

٤- ئەم کۆڕە کاریگەریی پۆزەتیڤی بەتەنها لەسەر میدیاکارانی ئوردنیش دانـەنا، بـەڵکو لـەوە تێپـەڕی بـۆ سیاسـییە ئوردنییـەکانیش. لـەو رووەوە، ئەنـدام پەرلـەمانی پێـشووی ئـوردن حـەمادە فەراعینـە لەبـەڕێوەبردنی دانیشتنە گفتوگۆئامێزەکەدا هاوسۆزییەکی زۆر و پیشتگیرییەکی گەورەی نواند کاتێك وتی:(( هەڵوێستمان لەدۆزی کورد هەڵوێستی لایەنگیریکردنی پێشوەختە و، دەبێ کورد دەوڵەتی سەربەخۆی خاوەن سـەروەری و سنوری سیاسـیی خـۆی هـەبێت. هـەروەها دەبـێ ئەمازیغییـەکانیش دەوڵـەتێکیان لەجـەزائیردا هـەبێ و ئیریترییـەکانیش دەوڵـەتێکیان لەسـۆماڵدا هـەبێ)). هـەروەها عەبـدولمونعیم ئـەلکوردی، دیبلۆماتکـاری پێـشووی ئـوردن لـە باڵوێزخانـەی ئـوردن لـەعیراق، وتـی: (( دامەزرانـدنی دەوڵـەتێکی کـوردی لەعیراقدا مافێکی سروشتیی کوردە بەبۆنـەی ئـەو ستەم و چەوسانەوەیەی کـە رووبـەڕوویان بووەتـەوە)). حـازم قەشـوع-ی سـکرتێری گشتیی حزبـی (رسـالة )ی ئـوردنیش ئـەوەی خـستەسەر و وتـی: (( ئێمـە پێویـستە رێـز لەبرایەتیی عـەرەبیمان لەگـەڵ کـورددا بگـرین، هـەروەها دەبـێ رێـز لـەداوا و هیواکانیـان بگـرین و هـەقی خۆشـیانە کەدەوڵـەتی خۆیـان دابمـەزرێنن)). ئەندازیار موسا ئەلموعایتە سکرتێری گشتیی ( پارتی چەپی دیموکراتی)ی ئوردنیش وتـی: (( پێویـستە لەسـەر هـەمووومان کە لەگـەڵ گـەلی کورددا بین

لەدیاریکردنی چارەنووسی خۆی و راگەیاندنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیدا)).. ئەوەشی خستەڕوو کە راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی هەقی کوردەو هەقی نەتەوەی گەورەی کوردە لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لەدوای نەتەوەی عەرەب.

٥- بەئاگاهاتنەوە بە مەسەلەی کورد تەنها لەوانەدا نەبوو، بەڵکو لە هەندێ لە ئەکادیمییە ئوردنییەکانیش وەك د. وەدیع ئەلشەرایحە کە مامۆستای ئابوورییە لەزانکۆی ئوردن ئەوەمان بیست کە بەوپەڕی راشکاوی و بوێری و ئاگایی زانستی و مێژوویی تەواوەوە وتی: ((راگەیاندنی دەوڵەتی کوردی لە کوردستانی عیراقدا مافێکی کەفالەتکراوە، بەڵام ژیانی دەوڵەتی کوردی لەچوارچێوەی عەرەبیدا، کانگای بەردەوامبوونێتی)).

پرسیاریش ئەوەیە: ئایا گەڕانەوەی ئاگایی عەرەبی و ئوردونی بەتایبەتی بە مەسەلەی کورد و بەهەموو مافەکانی لایەنەکانی کۆمەڵگا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و پێکهاتەکانی، بەردەوام دەبێت ؟ ئومێدەوارین کە وابێت..

# چۆن ئەتوانین پشتیوانی لەگەلی کوردی سوریا بکەین ؟

— ١ —

لەو کاتەوەی کە بەیاننامەی جیهانی بۆ پشتیوانیکردنی گەلی کوردی سوریا لەو مەینەتییە گەورەیەی کە لەگەڵ رژێمی ئێستای سوریادا تیایدایە، لەم رۆژنامەیە و زۆربەی ئامرازە میدیاییە عەرەبییە لیبراڵییەکانی نیشتمانی عەرەبیدا کە بەگشتی لە دۆز و مەسەلەی کورد تێدەگەن، بلاو بۆتەوە، ئیمزای ئازادیخوازانی کورد و عەرەب و نەژاد و مەزهەب و رەگەزەکانیتر لەسەر یەك دەگاتە پۆستی ( رێکخراوی بەرگریکردن لەکەمینەکان و مافەکانی ژنانی رۆژهەلاتی ناوەراست و باکوری ئەفریقیا).
ئەمەش ئەگەر بەڵگەبێت بۆ شتێك ئەوە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە جیهانی ئازاد لەگەڵ دۆزە مرۆییەکاندایە و بێ سنور پشتگیرییان دەکات. گرنگیش ئەوەیە کە ئازابین و ئەوەندەی پێویست بێت راستگۆیانە لەگەڵ هەقدابین.

— ٢ —

ئـەم بەياننامەيـە، ئـەمڕۆ جـارێكى دى بـڵاوى دەكەينـەوە بـۆ ئـەوەى ئەوانەى لەهەفتەى رابردوودا نـەيانتوانى بيخوێننەوە ئـەمڕۆ بيخوێننـەوە و ئەوانەى نـەيانتوانى ئيمزاى لەسـەر بكەن ئيمزاى بكـەن، چونكە ئـەوە بڕى ئيمزاكانە، كە لەسەر ئەم بەياننامەيە دەكرێن، هێزى تـەواوى پـێ دەبەخشن بۆ ئەوەى قەناعەتپێكەر و كارا و راستگۆيىَ بۆ ناوەنـدەكانى شـەرعييەتى نێودەوڵـەتى بەگشتى. بەم جۆرەش دەتـوانين يارمەتييـەكى گـەورەى گـەلى كوردى سوريا بدەين و، بەكردەوەش پشتگيرى و پشتيوانيمان لـێ كردبێت نەك تەنها بەقسە و ژاوەژاو..

— ٣ —

دوژمنـانى دۆز و مەسـەلەى كـورد لـەجيهانى عەرەبيـدا زۆرن. بەبۆنـەى دوژمنايـەتيى توندييـشيان بـۆ دۆز و مەسـەلەى كـورد لەهـەموو شـوێنێكدا بانگەشەى خوێنـەرانيان كردووە كە ئيمزا لەسـەر ئـەم بەياننامەيـە نەكەن و داوايـان لـە خوێنـەران كـردووە كـە لـەدژى ئـەم بەياننامەيـە يـەكبگرن وەك ئـەوەى ئـەم بەياننامەيـە داواى لـەنێوبردنى نەتـەوەى عـەرەبى و ئيـسلامى بكـات، لەكاتێكـدا كـە ئـەم بەياننامەيـە داواى ژيانـەوەى نەتەوەيـەك لـە نەتەوەكانى ئەم رۆژهەڵاتە پەڕموردە و دڵتـەنگ و زاڵمە دەكـات، نـەتەوەيـەك كە سەدان ساڵە لەماڧە سياسى و ئـابورى و كۆمەڵايـەتى و رۆشنبيرييەكانى بێبـەش بـووە. كـاتێكيش كـەرێكخراوێكى جيهـانيى وەك ( رێكخـراوى بەرگريكردن لـەماڧى كەمينـەكان و ژنـانى خۆرهـەڵاتى ناوەڕاسـت و بـاكورى ئـەفريقيا ) بـەرگرى لـە ماڧـەكانى كـورد دەكـا ئـەوە ئيـدى كەعبـەى دنيـاى

عـەرەبی کـەچ دەبـێ بەتایبـەتیش لەلایـەن بـەکرێگیراوانی موخابـەراتی عەرەبییەوە کە بەتایبـەت بۆ وەڵامدانـەوەی ئـەم جۆرە بەیاننامە لیبراڵییانـە، چەکدارکراون.

— ٤ —

لەیەکـەم هەفتـەی بڵاوکردنـەوەی ئـەم بەیاننامەیـەدا دەنگدانەوەیـەکی زۆر فراوانی هەبوو؛ بەڵام، هەروەك وتمان، ئێمە دەنگدانەوەی زیاترمـان دەوێت. دەشمانەوێ گەلی کـورد و هـەموو ئازادیخوازان بیسەلمێنن کـە ئێمـە لـەدژی هەموو دوژمنانی گەلی کوردین لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ئیتر ئەو دوژمنانە لە عەرەب بن یان موسڵمانان یان عەرەبە موسڵمانەکان.

— ٥ —

موخابەراتی سوری کۆمەڵێك لە ئەفسەرە نهێنییەکانی خۆی، بە تایبەت، بانگێشت کردووە بۆ وەڵامدانـەوەی هـەر نوسـەرێك لـە میـدیای عەرەبیـدا کـە هـەوڵ بـدات رەخنـە لـەرژێمی سـوریا بگرێـت یـان مـاف هـاوڵاتیی سـوریا بـوروژێنێ، ئـیتر عـەرەب بێـت یـان کـورد. نموونـەی ئەوانـەش ئەوەیـە کـە ئەفـسـەرێکی موخابـەراتی سـوری بـە پلـەی عەقیـد کـەخۆی لەبـەرگی فەیلەسوفاندا شاردۆتەوە؛ وتبووی: ( من خـەریکم بـەزەییم پێیتدا دێتـەوە ئـەی کـاکی نوسـەر ( شـاکر نابولـسی )، ئایـا دەکـرێ ئـەم درۆ و دەلەسـانە نـاوبنێین بەیاننامەیـەکی جیهـانی؟ یـان ئەمـە تـەنها دەمدرێژییـەکی شەخسییەو هەنـدێ بـای سـك و پـێچ و ئـازاری ریخۆڵەکانـە؟ ئایـا ئـەوەت

نەبیستووە کە دیمەشق میواندارییی یەك ملیۆن عراقیی کردووە ( کە لەولآتو لەناو خەڵکی خۆیاندان) لەو ملیۆنانانەی کە دیموکراتییە وشککردووەکەتان سەرگەردانی کردوون؟ ئایا ئەو ملیۆنانان هەتیوکەوتوو و بێوەژن و سەرنگومکراو و تەرمە بۆگەنکردوو و سوپا بەکرێنگیراوانەت نەبیستووە کە یاری بەخاکی وڵاتی دوو رووبارەکە دەکەن ؟

ئەم ئەفسەرە گومانی لەوەش کردووە کە ئەم بەیاننامەیە لە ( رێکخراوی بەرگریکردن لەمافی کەمینەکان و ژنانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و باکوری ئەفریقیا )ەوە دەرچوووبێت.. بۆ زانین ، ئەم بەیاننامەیە لەلایەن دامەزرێنەرانی ئیشکەری ( رێکخراوی بەرگریکردن لەمافی کەمینەکان و ژنانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و باکوری ئەفریقیا )ەوە نوسراوە، ئەگەر وانەبووایە، ئەوە بەیننامەیەکی فەرمی لە رێکخراوەکەوە دەرنەچوو..جا سەرەخۆشی لەگومانبەران و فاڵگرەوەکان و سحربازەکان.

ئەندامێکی تر لەئەندامانی ئەم دەزگایە کە خۆی خستبووە بەرگی رەبەنێکی ناسیۆنالیستەوە، وتی: (( من سوری نیم، کوردیش نیم ، بەڵکو هاوولآتییەکی عەرەبم لەناوەندی نەتەوەی سەروەر-ی عەرەبدا و رژێمی سوریاشم خۆشناوێت، بەڵام پێم گرانە کە ببینم شاکر نابولسی-ی فەلەستینیی هەڵهاتوو لەنیشتمانەکەی خۆی کە داکۆکی لە مافی کوردەکان دەکا وەك چۆن پێشتر بۆ بەرژەوەندیی ئەمریکا ئیشی دەکرد پێش روخانی بەغدا، ئاوها خەریکی دنەدان و هاندانە لەدژی سوریا.. نازانم چی دەوێت.. ئایا گرێی پەنابەرێتیی هەیە و دەیەوێت نەتەوەی عەرەب وێران بکات؟؟ ..((..

بۆ زانین، من فەلەستینی نیم ئەگەر شەرەفی ئەوەشم هەبێت کە فەلستینی بم، بەڵام فەلەستینی نیم. هەروەها من پەنابەریش نیم و پەنابەریش نەبوومە.. سا چ نائومێدییەکە بۆ ئێوە.

کاتێك کە ئەفسەرانی موخابەراتی سوریا درکیان بە کاریگەریی نێگەتیڤی گەورەی ئەم بەیاننامەیە لەسەر بەرژەوەندی و دەسکەوتەکانیان کرد و، درکیان بەوە کرد کە سبەینێ رژێمی سوریا بەهۆی ئەم بەیاننامەیەوە زیاترو زۆرتر ریسوا دەکرێ، شێت و هاربوون، بۆیە یەکێکیان وتی: (( ئایا هەر کەسێك چەند سەد یۆرۆیەکی لە کۆمەڵە و رێکخراوەکان وەرگرت دەتوانێ بەیاننامەیەکی گەردوونی لەم شێوەیە دەربکات..؟ ئەی دەسبرەکانی جیهان یەکبگرن..! کەی بوارم بۆ دەرەخسێ کە بەیاننامەیەکی جیهانی لەرێی خوا دەربکەم و یەك یۆرۆ چییە وەرینەگرم، دەریبکەم بەناوی ئەو خوێنەرە داماوانەی ناچاردەکرێن توپروهاتی هەندێ نوسەری زۆر بەرێز قوت بدەن))..

جا لەگەڵمدا سەرنجی کۆمەڵێك هەڵەی زمانەوانی و دارشتن لەم توانجەدا بدەن کە لەوە سەرهەڵدەدا ئەندامانی موخابەراتی سوری شتێکی دی نین جگە لە کۆمەڵێك نەزان و نەخوێندەوار و، بە ئاگر و ئاسن حوکمڕانیی گەلی سوریا دەکەن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تاقە وەڵامێك بۆ هەموو ئەوانە و خەڵکانی تر لە دوژمنانی هەق و راستی، پێشوازیکردنی گەورەی ئیمزاکردنە لەسەر ئەم بەیاننامەیە کە لێرەدا سەرلەنوێ بڵاوی دەکەینەوە بۆ ئەوەی ئەوانەی نەیانتوانیوە بیخوێننەوە بیخوێننەوە و ئیمزای لەسەر بکەن.

## بەیاننامەی جیهانی بۆ پشتگیری گەلی کورد لەسوریا

ئێمەی ئیمزاکەران لەسەر ئەم بەیاننامەیە، بەهەموو هێزێکی خۆمانەوە پشتگیریی لەگەلی کوردی سوریا دەکەین، کەڕووبەڕووی سیاسەتێکی شۆفێنی بووەتەوە لەلایەن رژێمی سوریەوە، هەر لەسەرەتای گرتنەدەستی دەسەڵاتەوە لەلایەن حزبی بەعسی دەسەڵاتدارەوە.

ئەوە بوو لەساڵی ١٩٦٦دا یاسای چاکسازیی کشتوکاڵی، جووتیارە کوردە هەژارەکانی بێبەریی کرد لەو یاسایەو نەیهێشت سوودی لێ ببینن و لەمیانی گفتوگۆی یاساکە لەئەنجومەنی گەلدا وەزیری کشتوکاڵ ئیعترافی لەسەر ئەو حاڵەتە کرد، لەو مێژووەوە تاوەکو ئەمڕۆ گەلی کورد لەسوریا قوربانی دەستی چەوساندنەوەی شۆفێنی هەمەلایەنەیە کە بەدەستگیرکردن دەستپێدەکات و بەکوشتن کۆتایی دێت؛ هەروەکو ئەوەی لەساڵی ٢٠٠٥دا شێخ محەمەد مەعشوق ئەلخەزنەوی رووبەڕووی بووەوەو لەلایەن موخابەراتی رژێمەوە دەستگیرکراو پاشان لەسێدارەیاندا بێ ئەوەی دادگایی بکەن و پاشان رایانگەیاند کەهەندێ کەسی نادیار رفاندویانەو پاشان کوشتوویانەو تەرمەکەیان لەسەر رێگایەك فڕێداوە.

لە٢٣ی ئابی ساڵی ١٩٦٢دا رژێمی سوری بەپێی مەرسومی ژمارە ٩٣ زیاد لە١٥٠ هەزار کوردی لەسوریا بێبەش کرد لەرەگەزنامە، بەپێچەوانەی ئەو رێککەوتننامەو راگەیاندنە جیهانییەی مافی مرۆڤ کە پارێزگاری لەمافی مرۆڤ و کەمە نەتەوەکان دەکەن لەجیهاندا، پاشان رژێمی سوریا لەساڵی ١٩٦٦دا لەناوچەی حەسەکە هەستا بەدروستکردنی پشتێنەیەکی عەرەبیی دروستکرد بۆ نیشتەجێکردنی عەرەب تێیداو لەساڵی ١٩٧٤یشدا ئەو پرۆسەیەی جێبەجێکرد، هەروەها چەندین زەوی و

زاری بەسەر خێڵە عەرەبییەکانی ناوچەی جەزیرەدا دابەشکرد وەکو جێبەجێکردنی سیاسەتێکی رەگەزپەرستانە: لەم دواییەشدا وەزارەتی کشتوکاڵ و چاکسازیی کشتوکاڵی یاسای ژمارە ١٦٨٢ی لەمانگی شوباتی ٢٠٠٧دا دەرکرد بەمەبەستی دروستکردنی پشتێنەیەکی نوێی عەرەبی، کە مەبەست لێی جیاکردنەوەی کوردەکانی سوریایە لەکوردەکانی کوردستانی عێراق و لەو پێناوەشدا ١٥١ خێزانی عەرەبی لەسەر زەوی و زاری کورد نیشتەجێکردووە، کە ئەمەش سیاسەتێکی بەرچاوی پاکتاوی رەگەزییە.

رژێمی سوری لەجیاتی ئەوەی لەهەوڵی چارەسەکردنی کێشەی کورددا بێت و دان بەمافەکانیاندا بنێت کەخۆی لەپێناسی کەسی و پەساپۆرت و مافی هاتووچۆکردن بەئازادی و چەند مافێکی سەرەکی تر دەبینێتەوە، بۆ ماوەی ٤٤ ساڵە بەردەوامە لەسەر سیاسەتە دوژمنکارییەکانی کە لەخراپەوە بەرەو خراپتر دەڕوات.

ئێمە کە لەسەر ئەم بەیاننامەیە واژۆمان کردووە، داوا لەهەموو رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لەجیهانی عەرەبی و ئیسلامی و هەموو جیهان دەکەین بەتایبەتی ئەو رێکخراوانەی کەبەرگری لەمافی مرۆڤ و هاووڵاتی دەکەن، هەروەها داوا لەئەنجومەنی مافی مرۆڤ لەنەتەوەیەکگرتووەکان دەکەین کەهەمووان بەیەکەوە ناڕەزایی دەربڕن دژی ئەو پێشێلکردنانە کەڕووبەڕووی مافەکانی کورد بووەتەوە لەسوریا، بەمافی چارەی خۆنووسینیشەوەو داوابکرێت لەحکومەتی سوریا کە دەستهەڵبگرێت لەچەوساندنەوەی کورد لەو وڵاتەدا، داواش لەڕێکخراوە سیاسی و مرۆییەکانی سوریا دەکەین کە گرنگی بدەن بەبەرگریکردن لەکێشەی رەوای کورد لەسوریا، چونکە چەوساندنەوەی گەلی کورد لەسوریا تەواوکەری چەوساندنەوەی گەلی سوریایە، کەڕزگاربوونی

یەکێکیان بەڵێنە بۆ رزگاربوونی ئەوی تریان لەدەستی دوژمنکارییەکانی موخابەرات کە رۆژانە ئازادییەکانیان پێشێل دەکات.

بۆ هەموو ئەو ئازادیخوازانەی کە دەیانەوێت ئەم بەیاننامەیە واژۆ بکەن، ناوو پیشەو شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیان بۆ ئیمەیلی (رێکخراوی بەرگریکردن لەژنان و کەمە نەتەوەکان لەرۆژهەلاتی ناوەراست و باکووری ئەفریقا (میموا) بنێرن:

memwa_z@yahoo.com

وەرگێڕی بەیاننامە:

ئاری عەلی غەریب

# شەڕی ئەهلیی عیراق: خەون و وەهم

**ـ ١ ـ**

لە بەرەبەیانی٩ ی نیسانی ٢٠٠٣ و کەوتنی بتەکانی سەدام حسێن–ی سەرکوتگەرەوە، لە کۆمەڵێکی زۆر لە تیۆریستانی گروپە تیرۆریستییەکان و نوسەرانی تیرۆریزم و فیقهزانەکانی تیرۆر و هاوچەشنەکانیان و، لە رەگەزگەلێکی زۆری نەتەوەپەرستەکانەوە دەخوێنینەوە و دەبیسین و دەبینین کە قسە لەسەر ئەگەری بەرپابوونی شەڕێکی ئەهلی دەکەن لە عیراقدا، شەڕێك کە تەڕ و وشکی تیا دەسوتێ و عیراق وێران دەکا و ئەوانە لە ناو دەبا کە فەرمانڕەوایی سەرکوتگەری پێشوویان روخاند. هەروەها ئەم بانگەشەیە دەنگدانەوەی خۆی لە راگەیاندنی رۆژئاوا بەتایبەتیش لە راگەیاندنی ئەمریکادا لەلایەن گروپگەلێکی جیاوازەوە لە حزبی دیموکرات و لە رۆژنامەنوسان و پێشکەشکارانی بەرنامە تەلەفزیۆنییەکان و نوسەران و ئەکادیمییان و سیاسەتمەداران و بڕیاربەدەستان لە کۆشکی سپی و

کۆنگرێس و وەزارەتی دەرەوە و هی ترەوە، دایەوە. هەروەها لەناو ئەو خەڵکانەدا، ئەو گروپانەش کە لە سیاسەتەکانی سەرۆك بۆش و لە کۆمارییەکان تورەن.

هەروەها لەلایەن زۆربەی رۆشنبیرە ئەوروپییە بەرهەڵستکارەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکاوە و، لەلایەن زۆرێك لە میدیاییە چەپەکانەوە ئەوانەی رق ئەستوورن لە ئەمریکا و سیاسەتە دەرەکییەکانی بەشێوەیەکی گشتی، لەلایەن بەرهەڵستکارانی پرۆژەی رۆژهەلاتی ناوەراستی-ی ئەمریکاشەوە و لەلایەن پارتە شیوعییەکانی ئەوروپاوە کە دوژمنایەتی و رقو کینەیەکی زۆریان لە ئەمریکایە بەو باوەڕەیان کە ئەمریکا بەشدارییەکی گەورەی کردووە و فاکتەرێکی کارا بووە لە روخاندنی ئیمپراتۆرییەتی یەکێتیی سۆڤێت و دارمانی دیواری بەرلین و هەڵوەشانەوەی ئەوروپای رۆژهەلات، هەڵمەتێکی فراوانمان بینی کە مزگێنیی بەرپابوونی شەڕی ئەهلی دەدا لە عیراقدا. بیرژان لویزان-ی شارەزای فەرەنسی لە کاروباری عیراق لە یەکێ لە ئەنجوومەنەکاندا کە سەربە حکومەتی فەرەنسایە، دەڵێ: (( سەرلەنوێ بونیادنانی عیراق کارێکە شکست دەهێنێ))، پێ لەسەر ئەوەش دادەگرێ کە عیراق توشی شەڕێکی ئەهلی دەبێت کە کۆتایی بۆ نییە. لە هەر رۆژنامەگەرییەکی رۆژئاوا زیاتریش کە مژدەدەری بەرپابوونی شەڕێکی نزیکی ئەهلی بووبێ لە عیراقدا یان شەڕێك کە بەرپابووبێ، رۆژنامەکانی بەریتانیایە بە تایبەتی ئەو رۆژنامانەی کە بەرهەڵستکاری سیاسەتی دەرەوەی تۆنی بلێر و گرێدراوێتیی ئەون بە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکاوە. لەو رۆژنامانەش رۆژنامەی ئیندیپێندت هەیە کە باتریك کۆکبێرن وتارێکی تیادا نوسیوە و دەڵێ: (( شەڕی ئەهلیی لە عیراق بۆتە کارێك کە نابێ گومانی لێ بکرێت و، بەغداد-یش وەرچەرخاوە بۆ ١٠ شار

کــە کەوتونەتــە دوژمنایــەتیکردنی یــەکتر، لــەو رووەوە ســوننە و شــیعە کەوتونەتە یـەکتر کوشتن))، لێرەشـدا دەبوایە کۆکبێرن لـە قەسـەکردنیدا ووردبوایە و بیوتبایە (( شەڕی مەزهـەبیی نێوان عەرەبی سوننە و عـەرەبی شیعە لـە بەغدادا کارێکە گومانی تێدا نییە)) نـەك بلێت (( شـەڕی ئـەهلی لەعیراق کارێکە نابێ گومانی لێ بکرێت )) چونکە شەڕی ئـەهلی ـ ئەگـەر ئێستا بە کردەوە لـە عیراقدا بەرپابوو‌بێت ـ ئەوە تـەنها لـە نێوان گرووپێکی دیاریکراوی عەرەبی سوننەو گرووپێکی دیاریکراوە لەعەرەبی شیعە.

ـ ٢ ـ

ئەمــەش ئـەتوانین درێــژی بکەینـەوە بـۆ سـەر تـەواوی چـاودێران و سیاسەتمەداران لە رۆژهەلات و رۆژئاواشدا، ئەوانەی کە لە بارەی کاروباری عیراقەوە قسە دەکەن و، بەهەڵەدا دەچن کاتێك کە قسە دەکەن یان بە گشتی لەسەر شەڕی سەرتاسەریی ئەهلیی عیراق کە ئێستا لە عیراقدا بەرپابوو‌بێت، دەنوسن. ئەوان هەر ئا ئەمەشە کە ئومێدی دەکەن و خـەونی پێوە دەبیـنن، بگرە عەقڵی بنەوەیان و ماخۆلانەکانیان وەهمێکیان پـێ دەڵێن کە ئـەوان بـە ڕاستی-ی لەقەڵەم دەدەن. لەم رووەوە ململانێی تایەفی و مەزهـەبی لـە نێـوان گرووپێکی کـەم لـە عـەرەبی سـوننە و گرووپێـك لـە عـەرەبی شیعە، بـە تـەنها ململانێـی ئـەمڕۆ یـان دوێنـێ نییـە. ئـەم ململانێیـە ململانێیـەکی مێـژوویی داپۆشراوە لە نائاگایی بەکۆمەڵی سوننە و نائاگـایی بە کۆمـەڵی شیعەدا لـە شـەڕی جەمـەل-ی ســاڵی ٦٥٦ ی زاینییــەوە لــە نێـوان حزبــی عائیـشە و سوپای خەلیفەی موسڵمانان عەلی کوڕی ئەبی تالب -دا کە تیایدا تەڵحە-ی کـوڕی عوبەیـدوڵڵا و زوبێـر-ی کـوڕ عـەوام و ٢٣ هـەزار لـە موسـڵمانان

کوژران، پاشان ناکۆکییەکە لە دوای شەڕی صەفین- ی ساڵی ٦٥٧ ی زاینیی نێوان سوپای موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیان و سوپای عەلی کوڕی ئەبی تاڵب – دا فراوان بووەوە و بە شەهیدبوونی خەلیفە (عەلی کوڕی ئەبی تاڵب) کۆتایی هات لە ساڵی ٦٦١ ی زاینیدا. لەو مێژووەشەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ ناکۆکی لە نێوان عەرەبی شیعە و سوننە بە تایبەتی لە عیراقدا بەردەوامە. ئەم ناکۆکییەش وەك ئەفسانەیەك هەیە دەڵێ: وەك جنۆکەی خۆحەشاردراو وایە لە قەفەسەکەیدا، هەر کە دیکتاتۆری لەعیراقدا ڕوخا و ئازادی‌و دیموکراسی لەعیراقدا بڵاوبووەوە ئەم جنۆکەیەش لە قەفەسەکەی دێتە دەرەوە. هەروەك چۆن ڤایرۆسەکان لە کەشوهەوا گەرمەکاندا زیاد دەکەن و بڵاو دەبنەوەو نەخۆشییەکانیان بڵاو دەبێتەوە، حاڵی ڤایرۆسەکانی شەڕی تایەفی‌و مەزهەبیش هەروایەو لەگەڵ گەرمبوونی کەشی سیاسییدا، کە خۆی لە بڵاوبوونەوەی ئازادی‌و دیموکراسیدا دەبینێتەوە، بڵاودەبێتەوە. ئەم ڤایرۆسە شەڕئامێزە مەزهەبی‌و تایەفییانەش لەشوێنی ساردوسڕو سەهۆڵبەندیی فەرمانڕەوایی دیکتاتۆرییدا خەوتبوون، ئەو فەرمانڕەواییەی کە بە دڵڕەقیی ساردوسڕی خۆی هەموو شەڕێکی تایەفیی فکری‌و ڕۆشنبیری‌و مەزهەبیی چەکدارانەی دادەپڵۆساند.

**— ٣ —**

میدیای عەرەبیی ڕق ئەستوور لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا، ئەم دەنگانەی، کە خاوەن کاریگەرییەکی گەورەن لە ڕۆژئاوادا، وەرگرت‌و پەخشی کردن‌و وای لە قەڵەم دان کە دەنگی هەق‌و ڕاستیی ڕۆژئاوان و، هیواو خەون‌و وەهمگەلێکی گەورەشی لەسەر بونیادنان و، کەوتۆتە ئەوەی، بە دووی ئەم دەنگانەوە، وەك بەبەغا باس لە ئەگەری بەرپابوونی شەڕێکی

ئەهلیی سەرتاسەریی عیراقی دەكات. بگرە لەم ماوەیەی دواییدا ئەوەی دا بەگوێی وەرگرانی (المتلقین ) عەرەبدا كە شەڕ لەعیراقدا بە كردەوە بەرپا بووە، ئەمەش لەخۆیدا بریتییە لە وێنەیەك بەبێ چوارچێوەو چاوەڕێی هەندێ مێژوونووسە تا بیخەنە چوارچێوەی مێژوویی شایستەی خۆیەوە.

زۆرێك لەسیاسییە عیراقییەكانیش بەرەو وتنەوەی ئەمە ڕۆیشتن. بەتایبەتی ئەوانەی كە ئێستا لەڕیزی ئۆپۆزسیۆنی عیراقیدان. لەم بارەوە ئەیاد عەلاوی لەقسەكردنیدا بۆ تۆڕی تەلەفزیۆنی I.B.Cی ئەمریكادا دەڵێت: شەڕی ئەهلی لەعیراق بە كردەوە دەستی پێكردووە.. دیاردەكانی ئەم شەڕەش شی دەكاتەوەو دەڵێ : " هیچ دامەزراوەیەك نییە بۆ پاراستنی خەڵك، لێرەو لەوێی عیراقدا پاكتاوكردنێكی ئەتنیكی هەیە، ئەمەش لە واقعدا بۆ ئاستی شەڕی ئەهلی چۆتە پێشەوە" ئەوەیش كەبەسەر بارودۆخی عیراقدا هاتووە دەخاتەڕوو و دەڵێ: " ئابوری گەیشتۆتە هیچ، خزمەتگوزارییەكان ناهەموارن، مەزهەبگەرایی لە ئارادایە، میلیشیاكانیش دەستی گرتووە بەسەر زۆرێك لە گەڕەكەكانی بەغدادا، ئەمانە واقعن و شتێك نین خەیاڵكرد بن".. هەرچی هینو فیۆرتنژ ـ ی شیكەرەوەی سیاسیی ئەڵمانیایە كە لەپەیمانگای ئەڵمانیای لێكۆڵینەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ـە، ئەوە ژمارەیەك سیناریۆی بۆ پاشەڕۆژی عیراق داناوە، لە یەكێكیاندا گریمانەی سەركەوتنی پرۆسەی سیاسیی كردووە و لە یەكێكی تریشیاندا گریمانەی سەرنەكەوتنی ئەم پرۆسەیە و گەیشتنی عیراقی كردووە بە دۆخێكی خراپتر كە لەو حاڵەتەشدا ئەگەری شەڕی ئەهلی زیاترە.

عاقڵە پێگەیشتووەکان لە سیاسییە عیراقییەکان درکیان بە حەقیقەتی ئەوە کردووە کە لە عیراقدا بەڕێوەدەچێت، ئەو مێژوو و واقعەش کە ئێستا هەیە بە چاوکراوەیی دەخوێننەوە نەك تەنها بە چاو .

دیارە عیراق هەر هەمووی نەگلاوەتە ئەم پاکتاوکردنە مەزهەبی و تایەفییەوە؛ هەر هەموو عیراقیش نییە کە خەڵکەکەی تۆڵەی کۆن لە یەکتری بکەنەوە. هەر هەموو عیراقیش نییە کە بەو گۆماوە ڕۆژانەیەی خوێنڕشتن دەخنکێت. ئەوانە بنکەی مەزهەبگەرا و تایەفەگەر-ی تۆڵەئەستێنن کە چەندین سەدەی دووردرێژە لە بن خۆڵەمێشی ئاگرینی فراواندا خەوتبوون، بەڵام ئاگری ئەم خۆڵەمێشە لە دڵدا هەر بەگڕگرتوویی مابووەوە، بگرە ئەمە، وەك لە کتێبەکەی خۆم ( بومەلەرزە)دا باسم کردووە، لە جۆری سێیەمی گڕکانە. لە جیهانیشدا سێ جۆری گڕکان هەیە، گڕکانی کارا، گڕکانێکیش کە گەرمیی نەماوە، یەکێکی تریش کە دوکەڵ و هەڵم دەبەخشێ، ئەمەش ئەو جۆرەی گڕکانە کە ئێستا لە نێوان هەندێ عەرەبی سوننە و عەرەبی شیعەدا هەیە . گڕکانیش دەرئەنجامێکی ڕاستەوخۆی ئەو کارابیە ئاگرییانەیە کە لە بن زەیدا هەن. ئەتوانرێ واش باس بکرێت کە شوێنێکە دەمێکی تێ دەکەوێت یان درزێك و لێیەوە مادەی تواوەی گەرم دەرئەپەڕێ، لەگەڵیشیدا هەڵم و غازات و تەپ و خۆڵەمێشی گڕکانی. لە ئەنجامی گوژمی ئەم ماددانەش و کۆبوونەوەیان و کەڵەکەبوونیان، تەنی هەرەم شێوە پێك دێت و بە درێژایی کات شێوەی شاخی گڕکانی وەردەگرێت. حاڵیش لەگەڵ ناکۆکییە تایەفی و مەزهەبییەکاندا هەروایە و

هەرکە تویکلێکی ناسك لە حوکمی دیموکراتیی نوێی لێبووردە دەبینیٚ پێیدا دەتەقێتەوە و گڕو ئاگرە داپۆشراوەکانی سەدان ساڵی خۆی بەسەردا دەکا. ئەمەش ڕێك ئەو شتەیە کە ئێستا بە بۆنەی دراوسێکانی عێراقەوە ڕوودەدەن وەك سوریا و ئێران کە شانبەشان وەستاون بۆ ئەوەی پرۆژەی سیاسیی دیموکراسیی عێراق و، هەروەها پرۆژەی فیدراڵیی عێراقیش، کە مافی خودحوکمڕانیی بەخشییە کورد، شکست بهێنیٚ، ئەوەش لە ترسی ئەوەی حەوت میلۆن کورد لە ئێران و سوریا کە ٢٩٪ ی ژمارەی کوردە لە جیهاندا، داوای هەمان شت بکەن. ئەم ڕاستییەش سەرۆك کۆمار جەلال تاڵەبانی لەکاتی سەردانەکەی ئەم دواییەی بۆ پاریس درکی پیٚ کرد کاتێك کە بە هۆشیارییەکی سیاسیی قووڵ و خوێندنەوەیەکی چاوکراوانەوە بۆ مێژوو، بوونی شەڕێکی ئەهلیی لە عێراق ڕەتکردەوە و ئاماژەی بەوەدا کردەوەکانی کوشتن کە ئێستا ڕوودەدەن هەندیٚ لە گروپە توندڕەکان ئەنجامی دەدەن ئەوەش لەپێناوی دروست کردنی ئاژاوەگێڕی لە نێوان ڕۆڵەکانی گەلی عێراقدا.

هەرچی مەسەلەی شەڕی ئەهلیی سەرتاسەرییە لە عێراقدا، ئەوە ـ هەر وەك مام جەلال تاڵەبانی وتی ـ وەك خەونێك دەمێنێتەوە و ئاژاوەگێڕەکان باسی دەکەن، وەکو وەهمێکیش لەکەللەسەری هەندیٚ چاودێرو سیاسییەکانی ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوادا، دەمێنێتەوە.

# ئایا بەڕاست،
# یەکبوونی عیراق لە دابەشبوونیدایە ؟

— ١ —

" ئەنجوومەنی شورای موجاهەدین " لە عیراق بە سەرکردایەتیی "ڕێکخراوی قاعیدە" لە تۆمارێکی دەنگیدا کە " کەناڵی ئەلجەزیرە" پەخشی کرد، دامەزراندنی " دەوڵەتی ئیسلامیی عیراق"ی ڕاگەیاند. ئەوەیش کە ناوی لێناوە " دەوڵەتی ئیسلامی "ی لە بەغدا و پێنج پارێزگای عیراق کە بەغداو پارێزگاکانی ئەنبار و دیالەو کەرکوك‌و سەلاحەدین‌و نەینەواو چەند بەشێکی هەردوو پارێزگای بابل‌و واست لەکۆی ١٨ پارێزگا کە عیراقی لێ پێك دێت، دەگرێتە خۆی، وەڵامدانەوەی پەسەندکردنی پەرلەمانی عیراقە بۆ یاسای پێکهێنانی هەرێمەکان‌و، وەڵامدانەوەیە بۆ ئەوەی کە بە " دەوڵەتی کوردەکان لە باکور" و " فیدراڵیی شیعە" ناوی بردووە. " ئەنجوومەنی شورای موجاهیدین"یش داوای لە "موجاهیدین" و زانایانی عیراق و شێخی عەشیرەتەکان‌و هەموو خەڵکی

سوننه کردووه که بەیعەتی ئەمیر ولموئمنین شێخ ئەبو عومەری بەغدادی بکەن. ئەم "دەوڵەتە ئیسلامییە"ش کە پشتگیریی هەندێ سەرگەورەی عەشیرەتەکانی بەدەست هێناوە هەوڵی ئازادکردنی دیکتاتۆری سەرکوتکەر سەدام حوسێن دەدات. لەهەواڵێکی گرنگیشدا کە پشت گوێ خرا تەنها لەرۆژنامەی واشنتۆن پۆستدا نەبێ کە بەبایەخەوە بڵاویکردۆتەوە، دەڵێ: ٣٠٠ سەرۆک عەشیرەتی عیراقی کە زۆربەیان سوننەن، لە شارۆچکەیەکی باشوری کەرکوکدا کۆبونەتەوە بۆ ئەوەی داخوازییەك بۆ ئازادکردنی سەدام حسێن دەربکەن. یەکێك لەو سەرۆك عەشیرەتانەش کە ژمارەی عەشیرەتەکەی دەگاتە ٥,١ ملیۆن کەس، وتی: ئەگەر ئەم داخوازییە جێ بەجێ نەکرێ ئەوە دەست دەکەین بەراپەڕینێکی رامانێنی میللیی گشتی.

— ٢ —

ئەوەی کە سەیرە هیچ گروپێکی ئیسلامیی سوننی یان رێکخراوێکی ئیسلامیی سیاسیی سوننی لە ناوخۆی عیراق و دەرەوەیشیدا ئەم دەبەنگییەی سەرزەنشت نەکرد. لە برازوتی ئیخوان موسلمین-یش و نوسەرانیانمان لە رۆژنامەگەریی عەرەبی و توانجدەرانیان لە کەناڵە ئاسمانییە عەرەبییەکان چاوەڕێ دەکرد کە ئەم رەفتارە دەبەنگانەیە سەرزەنشت بکەن، بەڵام هەموو ئەوانە بێدەنگ بوون وەك ئەوەی بە شەرمی کچانی عازەب و بێدەنگیان پیرۆزبایی دامەزراندنی " دەوڵەتی ئیسلامیی عیراق" بکەن و بە هیوای ئەوەبن ئەم " دەوڵەتە" ناوکێك بێ بۆ دەوڵەتی خەلافەتی ئیسلامیی بەڵێنپێدراو کە ئەو خەڵکانە بانگەواز بۆ دامەزراندنی دەکەن، ئەمە بە رادەیەك لەلایان بۆتە گرێیەکی سایکۆلۆژی و سیاسی،

گرنیەك كە پاڵی پێوە ناون میهرەبان بن و بگرین بەسەر دەوڵەتی خەلافەتی تاڵیبانـدا و بەرلـەویش خەلافـەتی ئومـەوی لـە ئەنـدەلوس و خەلافـەتی عوسمانی لە ئاستانە. ئەو خەڵكانە سەرخۆشیش بوون و مەستی گرتنی بە مەستیی خەلافەتی بەدەستهێنراو كاتێك كە بیستیان وتەبێژی " دەوڵەتی ئیسلامیی عیراق" دەڵێ: (( ئامانج لە دامەزراندنی ئەم دەوڵەتە ئیسلامییە بۆ پاراستنی ئاینەكەمان و خەڵكەكەمانە و بۆ رێگرتنە لە ململانێ و بۆ ئەوەیە كە خوێن و قوربانیی شەهیدەكانیان بە فیڕۆ نەچێت)) هەروەها وتی: (( بەغداد-ی ئەلڕەشید و خەلافەت كە باب و باپیرانمان بونیادیان ناوە لەدەستمان دەرناچێ مەگەر لەسەر لاشەكانمان)) ئەمە لە كاتێكدا، هات و هاوار و داوای فریاكەوتن بەرزدەبێتەوە و ناڕەزایی دەدەبڕدرێ لەبەرامبەر " یاسای هەرێمەكان". لەم رووەوە عەدنان دلێمی-ی سەرۆكی " بەرەی تەوافوق" دەڵێ: " بەرەی تەوافوق دانیشتنەكانی پەرلەمانی بایكۆت كردووە بە ئامانجی رێنەدان بە تێپەڕینی یاسای فیدراڵی لە رێی دەنگدانەوە، ئەوەش لە میانەی تەواو نەكردنی رێژەی یاسایی. بەرە ئەوەی كە لە توانا شیدا بووە كردوویەتی بۆ تەگەرە دانان لەبەردەم یاساكەدا و بەرپرسیار نییە لەبەردەم عیراقییەكاندا و لەبەردەم دەرئەنجامە سلبییەكانی لە دواڕۆژدا.".. سەلمان جومەیلی ـ ی پەرلەمانتار و ئەندامی بەرەی تەوافوق ـ یش وتی: ئەم یاسایە ئامادەكراوێكە بۆ دابەش كردن. خەڵەف ئەلعەلیان ـ یش كە ئەندامی " بەرەی تەوافوق"ە تێپەڕین و پەسەند كردنی یاساكەی بە پیلان ناوبرد.

هەروەها لە ناو عەرەبچی و نەتەوەپەرستەكاندا خەڵكێكی زۆرمان بەدی نەكرد سەرزەنشتی ئەم گەمە هەرزەكارییە و ئەم قەوارە تیرۆریستییە خەیاڵییە لافدراوانە بكەن كە خۆی لە " دەوڵەتی ئیسلامیی عیراق" دا

دەنــوێنێ. ئەمــەش وامــان لــێ دەکــا پێمــان وابێــت کــە عەرەبــچی و نەتەوەپەرســتەکان بــە بێــدەنگی و رووگیربوونــەوە پیرۆزباییــان لــەم کــارە دەبەنگانــە کردبێــت ، ئەمــەش لەبــەر خۆشویــستنی " دەوڵــەتی ئیــسلامیی عیراق" نا ، بەڵکو وەك کینـە و دژایەتیکردنی کورد و ئەو قەوارە سیاسییە فیدراڵییــەیان کــە ئێــستا خەریکە بـەرەو خـۆر رێگـای خـۆی دەبڕێـت و لـە سپێدەی نەوەدەکانی سەدەی رابردوورشەوە بۆتە دیفاکتۆ. ئەم هاوپەیمانییە ناڕاســتەوخۆیەش لــە نێــوان ئیــسلامگەراکان و نەتەوەپەرســتەکاندا لــە گۆرەپــانی عــەرەبی شــتێکی نــامۆ نییــە ئەگــەر ئــەوە بــزانین کــە ئێــستا هاوپەیمانییەکی سیاسی لە نێوان هەندێ گرووپی شیوعی و ئیسلامگەرا لە عیراقــدا هەیــە ، ئائەمــەش حــاڵی سیاســەتە : بەرژەوەنــدیی هاوبــەش و ئایدیۆلۆژیای جیاواز.

— ٣ —

کەواتــە لــە هــەموو ئەوانــە ئــەوە تێدەگــەین کــە سیــستەمی فیــدراڵی سیــستەمێکی ڕەوا و پــیرۆز و ئـارەزووکراوە کاتێـك لـە پێنـاوی دامەزرانـدنی دەوڵـەتی خەلافـەتی ئیسلامیدا بێت لـە ناوەڕاسـتی عیراق. بـەڵام سیـستەمی فیدراڵی کتوپڕ و بە پلەی ١٨٠ وەردەچەرخێ بۆ تـاوانێکی گـەورە دەرهـەق بــە ئیــسلام و عروبــەت و، وەردەچــەرخێ بــۆ سیــستەمێکی رۆژئــاوایی کۆلۆنیالیــستیی بارگــاوی بــە مــەرام و ئامــانجی قێــزەون و، مــەرام لــە جــێ بەجێکردنیــشی لــە عیراقــدا بــۆ پارچــە پارچــەکردنی عــیراق و لــەباربردنی یــەکبوونی و بــۆ دابەشــکردنێتی کاتێـك کـە کوردەکـان لـە بـاکوردا نیـازی دامەزراندنی قەوارەی فیدراڵیی خۆیـان هـەبێت . واتـە سیـستەمی فیـدراڵی لـە

نەریتی ئیسلامگەرا " موجاهیدینەکان"دا ئەم وتەیەی شاعیری بەسەردا جێ بە جێ دەبێت :

حەرامە بۆ بولبولەکانی خۆی کە بخوێنێ

حەڵاڵە بۆ باڵندەکانی تر لەهەر ڕەگەزێکی دی بن

ئەمە لە کاتێکدا کە – ئەگەر ئیسلامگەراکان بەوە بزانن– سیستمی فیدراڵی سیستمێکی سیاسیی پێشکەوتنخوازە و ناتوانن جێ بە جێی بکەن تەنها ئەو گەلانە نەبن، کە بەشێکی گەورەیان لە پێشکەوتنی سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیدا بەدەست هێناوە. هەر لەبەر ئەوە، ئەم سیستمە لە ڕووی سیاسییەوە لە پێشکەوتوترین وڵاتەکانی جیهاندابوو کە سەرکەوت، وەك ئەمریکا، کەنەدا، ئوستراليا، ئەڵمانیا، بەلجیکا، نەمسا و سویسرا. ئەگەر سیستمی فیدراڵیش بەشێوەیەکی تەواو و تەندروست لەعیراقدا جێبەجێ بکرێت ئەوە زۆر کێشەی عیراقی هەمەلایەن و جۆراوجۆر چارەسەر دەکات، چونکە فیدراڵی لە بنەڕەتدا واتە ( پەیماننامە و ڕێککەوتن ) ئەمەش بەو مانایەی کە زاراوە لاتینییەکەی هەیەتی foedus.

کاریگەریی " حاڵەتی عیراق "یش لەسەر جیهانی عەرەبی تەنها لە میانەی فیدراڵییەتەوە نابێ کە ئێستا زۆربەی شەبەنگەکانی گەلی عیراق لەپێکهاتنی دەوڵەتی عیراقی ساڵی ١٩٢١ەوە داوای دەکەن، بەڵکو ئەم کاریگەرێتییە بە لایەنە ئەرێ و نەرێکانیشیەوە کاریگەرێتییەکی گەورە دەبێت لەسەر جیهانی عەرەبی، ئەو جیهانەی کە لە بەرەبەیانی ٩ ی نیسانی ٢٠٠٣ەوە چۆتە چاوی زریانی جیهانگیری و چاوی زریانی مۆدێرنە و چاوی زریانی تیرۆریزمیشەوە. ئەگەر فیدراڵیش لە عیراقدا جێ بە جێ بکرێت و خواردنی ئەم فیدراڵییەتە هەموو عیراق نۆشی بکا، ئەوە دەبێتە نموونەیەك و لە زۆر لەو وڵاتە عەرەبییانەدا چاوی لێدەکرێ کە تایەفە

نەژادی و ئاینییەکانیان دوچاری گۆشەگیریی سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری بونەتەوە وەك ئەوە حاڵی عیراق بوو لە دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقییەوە ١٩٢١. هەموو ئەوەش مانای ئەوەیە کە دەوڵەتی عەرەبی لە هەر شوێنێکی جیهانی عەرەبیدا بێت داوای ئەوەی لێ دەکرێت کە چارەسەرێکی زووەخت و خێرا و واقعی و عەقڵانی بۆ کێشەی کەمینەکان بکات و مافە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانیان بدا بەرلەوەی کێشەکان خراپتربێن وەك ئێستا لە عیراقدا خراپتر بووە. هەر ئەمەشە کە هەندێ سیاسیی عیراقیی عەقڵانی و پێگەیشتوو لێی وریا بونەتەوە، لەوانە جواد ئەلعەتار ـ ی وتەبێژ بەناوی "رێکخراوی کاری ئیسلامی " لەعیراق کە دەڵێ :" فیدراڵی واتە پاراستنی یەکبوونی عیراق بە خاك و گەلەوە، چونکە ئەگەر راپرسی لەناو عیراقییەکاندا بکرێت لەبارەی مەسەلەی یەکبوونی عیراق بەبوونی رژێمێکی سەراپاگیری دیکتاتۆری، ئەوە ئەنجامی راپرسییەکە رەت کردنەوە و خواستنی جیابوونەوە و دابەشکردنی عیراق دەبوو، لەم رووەشەوە جارێکیان جیابوونەوەی کوردستانمان بەرلە ١٢ ساڵ لە سایەی رژێمی دیکتاتۆریی سەدامدا بینی، ئەو کوردستانەی کە ئێستا لە سایەی سیستمێکی فرەیی و فیدراڵیدا بەشێکە لە عیراق. کەواتە فیدراڵی مسۆگەرکەری یەکبوونی عیراقە و دیکتاتۆرییەتیش رێگای دابەشکردنی عیراقە " .

زۆر لە شارەزایانی رۆژئاوایی و بە تایبەتیش لە ئەمریکا پشتگیریی ئەم ئاراستەیە دەکەن. دیبلۆماتی ئەمریکی رۆبەرت پیرسۆن-ی بالۆیزی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش لە تورکیا لە سالانی ٢٠٠٠-٢٠٠٣، وای دەبینێ کە " لە جیاتی پێداگرتن لەسەر بونیادنانی عیراقێکی یەکگرتووی بە گران بەدیهاتوو، رەنگە باشتر وابێ کە عیراق دابەش بکرێت بۆ سێ بەش و دابەش ببێت بەسەر شیعە و سوننە و کورددا. ئەوان ئەم بۆچوونەشیان لەسەر بنەمای ئەوەیە کە دابەشکردن تاقە چارەسەرە بۆ رێگرتن لە شەڕ و یەکتر کوشتنی تایەفیی نێوان سوننە و شیعە و لێك جیاکردنەوەیان بە بۆنەی نەتوانینیان لەوەی پێکەوە و لە ژێر یەك چەتردا بژین. ئەوەی پەیوەستیشە بە کوردەوە، ئەوە توانای گەورەی خۆیانیان لەبەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان بە شێوەیەکی سەربەخۆ دەرخستووە ئەوەش لە سالی ١٩٩١ەوە.

لەلایەکی دی، هەندێ چاودێری دۆخی عیراق کە خاوەنی بڕێکی زۆرن لە دانایی و ژیری وەك نموونەی سیناتۆر( جۆزیف بایدن) و ( لیزلی گێلب )ی سەرۆکی پێشووی " ئەنجوومەنی پەیوەندییە دەرەکییەکان" وای دەبینن کە باشتر وایە قسە لە عیراقێکی فیدرالی بکرێت کە سێ ناوچە سەرەکییەکەی دەسەلاتی فراوانیان هەبێ لەگەل بوونی رێککەوتنێك لە بارەی دابەشکردنی داهاتەکانی نەوت. ئەگەر عیراقێکی فیدرالیش دروست بێ و کۆتایی بە تۆرانی ئەو لایەنە توندڕەوانە بهێنێت کە بانگەواز بۆ جیابوونەوەی تەواو دەکەن ئەوە عیراق سەقامگیرییەکی ئەوتۆ بەخۆوە دەبینێ کە پێشتر شتی

وای بە خۆوە نەدیوە و ئاسایش و ئارامیش سەرانسەری ولآت دەگرێتەوە.
بەلآم رەنگە دواکەوتنی سیاسی و کۆمەلآیەتیی عیراق دەرئەنجامی پێچەوانە بەدەستەوە بدا ئەگەر فیدرالی جێ بە جێ بکرێ. ئەگەری بەهێز -- بەداخەوە – ئەوەیە کە فیدرالییەکی دەلەمە و نا تونوتۆل دەربکەوێت و زریانی توندوتیژیی بەربلآوی نێوان تایەفەکان لێی بدا ، ئەمە لەگەل هەولدانی لایەك یان دوو لا بۆ جیابوونەوەی تەواو. بەم مانایەش دەشێت، هەروەك رۆبەرت بیرسۆن جەختی لەسەر دەکاتەوە، کۆنفیدرالی وەربچەرخێ بۆ بۆمبێکی تەوقیتکراو و بە ڕووی ولآتە یەکگرتووکان و ولآتانی دەوربەری عیراقدا بتەقێتەوە.

# ئێمەین دزەکانی عیراق نەك ئەمریکا ..!

— ١ —

لە ساڵی ٢٠٠٣ و لەدوای روخانی رژێمی دیکتاتۆریی پێشووەوە هەتاوەکو ئێستا، ئێمە لەبارەی ریسواییەکانی ئەو پارە دزینانەوە دەبیستین و دەخوێنینەوە کە لەعیراقداو ناوە ناوە دێ، لەلایەن هەندێ لە بەرپرسانی گەورەی عیراقەوە ئەنجام دەدرێن کە لەوەهمی ئەوەدا دەژین هێشتا رژێمی سەرکوتگەر ماوە. دوایین ئەو ریسواییانە ئەوەیە کە دادوەر ((رازی حەمزە ئەلرازی))ی سەرۆکی دەستەی دەستپاکی ( النزاهـة )ی گشتیی عیراق دوپاتی کردۆتەوە. ئەو بەر لەچەند رۆژێك ئەوەی دوپاتکردەوە کە کۆی ئەو بڕە پارانەی کە دەستەکەیان لە چوارچێوەی مەسەلەی بە فیڕۆدانی پارەوپولی گشتیدا لێیان کۆڵیوەتەوە گەیشتۆتە ٨ ملیار دۆلار، ئاماژەی بەوەش کرد کە ٨ وەزیر و ٤٠ بەڕێوەبەری گشتی لەسەر مەسەلەی گەندەڵی حەواڵەی دادگا کراون. رازی وتی: گەندەڵی لە هەموو جیهاندا هەیە، بەڵام بە رێژەی جیاواز. لە عیراقدا گەندەڵیی کارگێڕی گەیشتۆتە

ژەیەکی زۆر بەرز. رازی، بارودۆخی ئاسایش و ئارامی-شی لە عیراق
مە کرد و پرسی: کوا ئاسایش و ئارامی؟ ئەمڕۆ ئەگەر بڕێك پارە بنێرین
ۆ بانك ناتوانین گەیشتنی ئەو پارەیە مسۆگەر بکەین. رازی ئەوەشی
ونکردەوە کە ٨ وەزیر و ٤٠ بەڕێوەبەری گشتی لەسەر مەسەلەی
ندەڵیی کارگێڕی حەواڵەی دادگاکراون و هەر هەموویان بۆ دەرەوەی
راق هەڵهاتوون و داوایان لەسەرە.

## ـ ٢ ـ

ئەوەی ئەمڕۆ لەعیراقدا روودەدات شتێکی نوێ نییە بۆ بەرپرسانی
ەرەب. لەمەوبەر گەنجینەکانی زۆر دەوڵەتی عەرەبی بەری رۆژهەڵات و
ۆرئاوای عەرەب بەتاڵان براون و، ئەو دەوڵەتانە پارەو پولە دزراوەکانیان
گێڕاوەتەوە. ئەو پارەو پولانە-ش لە گیرفانی گەلانی ئەو وڵاتانە
رابوون. دزینە زۆرەکانی بەرپرسانی عەرەب بە دەسگرتن نییە بەسەر
نکی ناوەندیدا بە رۆژی نیوەڕۆ وەك هەر باندێکی تر، بەڵکو بەچەند
گایەك دەبێت کە ئەو بەرپرسانە دەیزانن، ئەو بەرپرسانەی کە ئەگەر
توفێڵ بێزاریان بکات دزی لەدەوڵەت دەکەن، ئەوەش لە رێگەی وەرگرتنی
ولەی زۆروزەوەندەوە لەو کۆمپانیایانەی بەڵێندەرایەتی کە پرۆژە
یاجیاکانی دەوڵەت جێبەجێ دەکەن، کارێك کە ئەو کۆمپانیایانە ناچار
کات گرێبەستەکانیان بە ئەمانەتێکی تەواو و شەفافییەتێکی روون
ێبەجێ نەکەن. دزیکردن لە دەوڵەت لە هەندێ وڵاتی عەرەبیدا خەریکە
شبێتە نیشانەیەك لە نیشانەکانی زیرەکی و بلیمەتی. هەر کەسێکیش کە
ی لە دەوڵەت دەکات ئەوە ئەو کەسە ( رێنوێنکەر) و ( والاکار)ەیە کە

دەزانێت چۆن دەست دەگرێت بەسەر پارەو پولی بەرەڵڵاکراوی گەلدا بۆ هەرکەسێك کە دێت و دەچێ و خۆی پیادا دەکات. بگرە هەندێ لە وڵاتانی دراوسێی عیراق بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هانی بەرپرسان دەدەن بۆ دزینی پارەوپولی گشتی. بۆ نموونە دەسەلاتدارانی ئەم وڵاتانە وەزیرەکان لەو خەڵکە دەسکورتانە دادەنێن کە نە لە سیاسەت دەزانن و نە لەحوکمڕانی ئەمە بۆ ئەوەی سوود لە دزینی پارەو پولی گشتی وەربگرن لە جیاتی ئەوەی لە گیرفانی تایبەتیی خۆیانەوە، وەك یارمەتییەك بۆیان، پارەیان پێ بدەن. لێرەوە لە هەندێ لە وڵاتانی دراوسێدا دەبینین کە حکومەتەکان زۆر یەك لەدوای یەك دێنە گۆڕێ و خێراش گۆڕانیان بەسەردا دێت. لەم رووەوە لە ماوەی نیو سەدەدا زیاتر لە ٥٠ حکومەت هاتۆتە سەر حوکم، واتە هەم حکومەتێك لە ساڵێکدا، جا مەبەستێك لە مەبەستەکانی ئەوەش ئەوەیە کە خێر بەسەر هەموو پاك و دڵسۆزەکاندا ! ببەشێتەوە، ئەو خێرەش خێری دزینی پارە و پولی گشتییە!.

دزینی پارە و پولی دەوڵەت-یش، یان گەل، ئاسانترین جۆرەکانی دزیکردنە، لە هەمووشی قەڵەوکەرترە، لە هەموویشی خێراتر بەدەست دەهێنرێ، لە هەموویشی کەمتر سزای هەیە و بواری ئەوەی تیایە بگێڕدرێتەوە. بە دەگمەن هەیە ببینین بەرپرسێکی گەورە لە دەوڵەتێکی عەرەبیدا بە تۆمەتی دزیکردن دەستگیرکراوە و حوکمدراوە و زیندانی کراو و پارە و پولە دزراوەکانیش گێڕدرابێتنەوە. لەهەندێ جاری کەمدا شتی لە جۆرە لەجیهانی عەرەبیدا روودەدات، بەلام مەبەست لێی ساختەکارییەکی سیاسییانەیە نەك قەلاچۆکردنی گەندەڵی و نەهێشتنی دزینی پارە و پولی گشتی.

— ٣ —

دزینی پارە و پولی گشتی، تارادەیەك، لە هەموو ولاتانی جیهاندا
وودەدات، بەلام بەچەند ریژەیەکی لێك جیاواز. لەگەڵ ئەوەدا ئەوەی
ئوری بۆ دزینی پارە و پولی گشتی دانا دیموکراسییە کە بێگومان بەرەو
مەفافییەتمان دەبات. هیچ شەفافییەتێکی راستەقینەش بوونی نییە بەبێ
یموکراسیەتێکی راستگۆیانە و بە تەواوی جێبەجێکراو.

بەلام دەی لە کوێوە دەکرێ شەفافییەت بێتە دی کە دەمی خەڵکی
اخراو بێت؟ لە کوێ-ش دەتواندرێ رۆژنامەگەری دزینەکانی پارەو پولی
شتی ریسوا بکات کە رۆژنامەگەریی خۆی بە ریژە زۆرەکەی خۆماڵ
رابێت و دەوڵەت خاوەنی بێت، دەوڵەتێك کە خۆی پارێزەری گەندەڵی و
زینی پارەو و پولی گشتی بێت؟

لە کوێ ئۆپۆزسیۆنیش ئاماژە بۆ دزەکان و تالانچییەکان بکات کە
ۆپۆزسیۆن خۆی داپڵۆسێنراو بێت نیوەی لە زینداندا بێت و نیوەکەی
ریشی لە مەنفاکانی جیهاندا ئاوارەبێت؟

لە کوێ دادگا - ش بەدوای ئەوانەوە بێت کە پارە و پولی گشتی دەدەزن
ـە دادگا بۆخۆی سەربەخۆ نەبێت و دەستەی دادوەری لەژێر دەسەلاتی
ەرمانرەوادا بن و وەکو ئەڵقەی ئەڵماس لە پەنجەیدابن کەی ویستی دای
نێت و کەی-ش ویستی بیکاتەوە پەنجەی. دادوەر لای فەرمانرەوای
یکتاتۆردا بریتییە لە ئەڵقەی فەرمانەکان لەکاتێکدا کە دادوەری راستەقینە
ـۆی فەرمانرەوایە. بۆیە دەبینین کە کۆمەڵگای رۆژئاوا لە دزرانی پارەو
ولی گشتی بەتاڵ نییە، بەلام لەسایەی دیموکراسی و شەفافییەتدا ئەو

دزانە ئەوەندە ئابا ئاشکرا دەبن و دەستگیر دەکرێن و دادگایی دەکرێن و پارە پوڵە دزراوەکانیش دەگێڕدرێنەوە. دەشێت ئەو بەینامەیەی دادوەر رازی حەمزە ئەلرازی . یش هەر سیمایەك بێت لە سیماکانی ئەو شەفافییەتەی کە عیراقی نوێ دەستی بە پەیڕەوکردنی کردووە، ئەمەش لەئەنجامی ئەو ئیستحقاقە دیموکراتییەی کە لەبەرەبەیانی ٩ی نیسان ـ ی ۲۰۰۳ەوە ڕێگای خۆی گرتۆتەبەر بەرەو عیراق.

بۆ عیراقی نوێ هیوای ئەوە دەخوازین کە بەم جۆرە دیموکراتیزە ببێ و شەفاف بێت. لەگەڵ ئەوەدا ئێمە بەوپەڕی دڵنیاییەوە ئەوەش دەزانین کە عیراق وەك بەشێکی دانەبڕاو لە جیهانی سێیەم دەمێنێتەوە، ئەو جیهانەی کە هەتا هەردوو گوێی لە گەندەڵیدا نوقم بووە و، وەکو بەشێکی لەبەشکردن نەهاتووی جیهانی عەرەبی-یش دەمێنێتەوە، ئەو جیهانەی کە دوچاری نەگبەتیی گەندەڵی و دزینی موڵکی گشتی بووە، ئەو بەهایانەش بوونەتە بەشێك لە کەلەپوری نوێی عەرەب وەك چۆن بەشێکیش بوون لە کەلەپوری کۆنی عەرەب.

— ٤ —

ئەوەی کە لەعیراقدا روودەدات لە بابەت گەندەڵی و دزین و بەتاڵانبردنی پارەو پول و موڵکی گشتی لە میانەی زۆر رووداوی ماوەی چوارساڵی رابردوو کە دوایینیان ئەوەبوو کە دادوەر رازی حەمزە ئەلرازی سەرۆکی "دەستەی دەستپاکی گشتی " ئاماژەی پێدا، زۆرێك لە دۆستانی عیراق لە جیهانی عەرەبیدا خەجاڵەت دەکات لە ناویاندا ئەو لیبراڵیسستانەی کە بەهێز و توانا و ئازایەتییەکی لەکۆتایی نەهاتووەوە لایەنگریی عیراقـ

نویٚ-ن، هەروەها رای گشتی ئەمریکا و، رای گشتی رۆژئاواش کە لایەنگر-ی پێویستیی ئازادکردنی عیراق بوون لە ستەمکاری. ئەوان هەموو بەیەك دەنگ دەڵێن: عیراق، ئەو هەموو دوژمنە تیرۆریست و بکوژانە و ئەو بەرهەڵستکارانەی عیراقی نویٚ-ی بەسە. عیراق ئەو نەگبەتییە رۆژانەییەی بەسە کە هەموو رۆژێك لەو ژمارە زۆرەی قوربانیدا بەخۆوەی دەبینیٚ. نابیٚ سیاسییە عیراقییەکان و پیاوانی دەوڵەتیی عیراق بە دزینی پارە و پولی گەل نەگبەتییەکانی ئەم گەلە زیاتر بکەن. ئەو ئەمریکییانەی کە لەساڵی ۱۹۹۱دا دەوترا بۆ ئازادکردنی کوەیت هاتوون لەدەستی دوژمنکاریی گوناهبارانەی سەدام، دلۆپێك نەوتیان لە کوەیت یان سعودیە نەدزی. هەر ئەوانیش کە دوێنیٚ بۆ ئازادکردنی عیراق هاتن لە حوکمڕانیی ستەمکاری سەدام یەك دلۆپ نەوتیان لەعیراق یان یەك دلۆپ ئاویان لە دیجلە یان فورات ، یان دەنکە خورمایەکیان لە دارخورماکانی عیراق نەدزی. ئەو کۆمپانیا ئەمریکییە نێوبانگ خراپانەش کە لەرێگەی بەرتیلی گەورە پیاوانی دەوڵەتەوە دزییان کرد یان هەوڵی دزیکردنیان دا بۆ تێپەڕینی پرۆژە و بەڵێندەرایەتییەکانیان، ئاشکراکران و بە توندی سزادران وەك دۆخی ناو ئەمریکا خۆی و دۆخی سیستمە توندوتۆڵەکەیشی لە بواری قەلاچۆکردنی گەندەڵی و دزینی پارەو پولی گشتیدا. بێگومان تاوانباریش هەر ئەو کەسە دەبێت کە داوای بەرتیلی کردووە و پێی لەسەر داگرتووە. جا لە عیراقی نوێدا لە سەرمانە لەخوا بترسین و خوا بناسین.

# گەلێك،
# كە ئاشتنی زۆردارەكەی خۆی ڕەت دەكاتەوە!

— ١ —

حوكمی لەسێدارەدان بۆ سەدام حسێن–ی زۆردار و كۆمەڵێك لە پیاوە خراپەكانی دەرچوو. ئەم حوكمدانەش لای زۆربەی ئەو خەڵكانەی كە بیستیان یان خوێندیانەوە بەساردی و بێ باكی كەوتەوە، ڕەنگە لەبەر ئەوەی زۆربەی خەڵك لە ئەستی خۆیاندا یان لە عەقڵی بنەوەیاندا سەدامیان لە بەرەبەیانی ٩ ی نیسانی ٢٠٠٣ەوە، ئەو دەمەی كە یەكەم بتەكانی زۆرداری لە گۆڕەپانی فیردەوس–ی بەغدادا ڕوخێنرا، لە سێدارە دابێت و، بگرە ڕەنگە لەبەر ئەوەی ئازادیخوازان و شەرەفمەندان لە جیهانی عەرەبی و لە هەموو شوێنێكی جیهاندا باوەڕوایان وابوو كە سەدام–ی زۆردار ڕوخا تەنانەت ئەگەر لە دوای قەسابخانەی دوجێل و هەڵەبجە و قەسابخانەكانی تری باكوری عیراق زیندوویش بێت. لەم ڕووەوەشەوە زۆردارانی عەرەب نە بە دادپەروەرانە دەمرن، نە بە داپڵۆسین و نە بە شۆڕش. چەندین شۆڕشی

عەرەبییش بە هیوای دادپەوەرییەوە بەرپابوون و زۆرداری هەر کەمی نەکرد، بەڵکو زۆرداری، وەك تفەنگ، لەم شانەوە گواسترایەوە بۆ ئەو شان .

## — ٢ —

زۆرداری شتێك نییە لە ئاسمانەوە هەڵبکا ئەوەندەی بەرهەمی گەل-ی ترسنۆکە. لە پشت هەموو زۆردارێکیشەوە گەلێکی ترسنۆك هەیە. گەلی ترسنۆکیش گەورەترین یارمەتیدەری خولقاندنی زۆردار و زیادبوونی ستەمێتی. زۆریی بوونی زۆردارانیش لە مێژووی کۆن و نوێی عەرەبدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە باب و باپیرانمان ترسنۆك بوونە. ئێمەی نەوەکانیشیان هەروا ترسنۆکین و بگرە ئێمە هەر خۆمان بە بێدەنگیمان لە فەرمانڕەوایانی زۆردار، زۆرداربووین بۆ خۆمان، ئەوەی کە لە زۆرداریش بێدەنگ بێت ئەوە هاوبەشی زۆردارە.

ئۆسکار وایڵد ـ ی شاعیری ئینگلیزی دەڵێت : زۆردار سێ جۆری هەیە، ئەو زۆردارەی کە سەرکوتکەری جەستەکانە. ئەو زۆردارەی کە سەرکوتکەری گیانەکانە، ئەو زۆردارەش کە لە چەشنی سێیەمە واتە سەرکوتکەری جەستە و گیانەکانە. یەکەمیان فەرمانڕەوایە، دووەمیان پیاوی ئایینییە، سێیەمیشیان گەلی ترسنۆکە.

زۆرداری وەك ململانێی ژیانی هەتاهەتایی و بنەڕەتی دەمێنێتەوە. ململانێش لە ژیاندا لە نێوان بیروباوەڕەکاندا نییە، لە نێوان هەق و ناهەقیشدا نییە، لە نێوان راستی و ساختەییشدا نییە، بەڵکو ململانێیە لە نێوان ئەوانەی کە خاوەنی دەسەڵاتن و خەڵکی تری پێ دادەپڵۆسێنن و ئەوانەی دەسەڵات داپڵۆسیون و هەوڵی رزگاربوون دەدەن لە داپڵۆسین.

## ـ ٣ ـ

سەدام حسێن سەرگەورەی زۆرداران و مامۆستای زۆرداریی بوو لە جیهانی عەرەبیدا. وەك بەندەر بن سوڵتان - ی باڵیۆزی پێشووی سعودیە لە واشنتۆن لە کتێبی ( حاڵەتی نکوڵی)دا دەیگێڕێتەوە، جارێکیان سەدام بۆ شانشین فەهەد بن عەبدولعەزیز - ی نوسیبوو و رایسپاردبوو کە پێنج سەد کەس لە شوێنکەوتوانی جهێمان ئەلعەتیبی کە حەرەمی مەکەی لە ساڵی ١٩٧٩دا داگیرکردبوو، لە سێدارە بدات و براکانی ئەو یاخیبووانە و باوکەکانیان و هەرکەسانێکیش کە بە خزمایەتیی پێیان دەگەن لە سێدارە بدرێن، ئەمەش ئەو نەریتە بوو کە سەدام لە عیراقدا پەیڕەویی دەکرد. گومانیشی تێدا نییە کە سەدام قوتابخانەیەکی ناسراو و بەنێوبانگی زۆرداریی عەرەب بوو، هەر خۆیشی فەرمانڕەوای نوێکەرەوەی شێوازەکانی زۆرداری بوو، زۆرداریییەك کە پێش ئەوانەی پێش خۆی کەوتبوو لە شێوازەکانی زۆرداریدا، ئەمە تا ئەو رادەیەی زۆرداریتیی ئەو، واتە سەدام، لە جیهانیی عەرەبیدا، بۆتە بەشێك لە سروشتی سیاسەتی عەرەبی و فەلسەفەی فەرمانڕەوایی عەرەبی. لێرەشەوە زۆر گران بوو بۆ عەرەب پاساوی دادگاییکردنی سەرۆکەکەیان بدەن، چونکە لە هەزاران ساڵەوە ئەمە یەکەمین جارە لە مێژووی عەرەبدا سەرۆکێکی عەرەبی دادگایی بکرێت. پێشتر روونەداوە عەرەب سەرۆکێك یان میرنشینێك یان شانشینێك یان خەلیفەیەك دادگایی بکەن و بڕیاری مەرگی بەسەردا بدەن وەك لەگەڵ سەدام حسێندا روویدا. بۆیە لە رۆژانی پێشوودا بینیمان کە چۆن کەناڵە ئاسمانییەکان بە دیمەنی ساختەی رابردووەوە لێمان هاتنە دەرێ کە

وێنەکانی سەدام ـ ی زۆرداریان تیادا بەرز دەکرایەوە و بە ناویەوە دروشم دەوترایەوە لەو دەمەی کە سەدامی زۆردار فەرمانڕەوای ڕەهابوو. لە ڕۆژنامەکانی سەدامدا، کە هێشتا لە لەندەن و جیهانی عەرەبیدا دەردەچن، ئەو وێنە کۆنانەی قوتابیانی کوڕ و کچی منداڵی قوتابخانەکانیشمان،کە سەرلەنوێ بڵاوکرابوونەوە: بینی کە تیایدا وێنەکانی سەدامی زۆردار بەرزدەکەنەوە لەو دەمەی کە سەدام لە عیراقدا خەلیفەی خوابوو لەسەر زەوی. ناڕەزایی زیاتر لە هەشت سەد پارێزەریش لە ئوردن و ژمارەیەکی زۆری تر لە میسر و سوریا و لوبنان و فەلەستین و مەغربی عەرەبی-مان بۆ بڕیاری دادگا بە لە سێدارەدانی سەدام، خوێندەوە. کۆنگرەی ناسیۆنالیستی عەرەبیش بە سەرکردایەتیی خەیرەدین حەسیب و مەعن بەشور بڕیاری دادگایان ڕەتکردەوە. زۆرێک لەرۆشنبیرانی عەرەبیش، ئەوانەی کە ڕاهاتوون گیرفانیان لەو ئاڵتوونەی سەدام پڕ بکەن کە لە ئارەقەی گەلی عیراق دزراون، وتارگەلێکیان لە تۆڵەخوازی و باسکردنی چاکەی سەدام و حەسرەت بۆ فەرمانڕەوای " دادپەروەر"! نووسی.ئەوان کۆمەڵێک لە خاوەن ڕاکان و دروستکەرانی سیاسەتیش لە ئەمریکا و سەربە حزبی دیموکراتیی ڕکابەری ئیدارەی جۆرج بۆش-یان کردە گەواهی. هەندێک لە ڕۆشنبیرانی سەدامیی عەرەب-یش وتیان دەرئەنجامەکانی جەنگی عیراق سزایەک بوون بۆ بوش و ئیدارەکەی و پارتەکەی بە کەوتنیان لە هەڵبژاردنەکانی کۆنگرێسی ئەم دواییە زیاتر لەوەی سزایەک بێت بۆ سەدام حسێن بە دەرکردنی بڕیاری لەسێدارەدانی .ئەوانە درک بەوە ناکەن ئەوەی لە عیراقدا ڕوویدا لە پەکخستنی ئازادی و دیموکراسی و لەم ئاژاوە ڕۆژانەییە زۆرەی بەغدا زیانە بۆ عیراق و گەلی عیراق زیاتر لەوەی زیان بێت بۆ بوش و پارتی کۆماری.

— ٤ —

ئەمە یەکەم جار نییە کە تیایدا کۆمارییەکانی ئەمریکا هەڵبژاردن دەدۆڕێنن. ١٢ ساڵ لەمەوبەریش دۆڕاندیان و ئەوەتا ئەوان ئەمڕۆ جارێکی تریش دەیدۆڕێنن. لەم رووەوە رۆژگارەکانی‌حوکمڕانی لە وڵاتە دیموکراتەکاندا دەسبەدەس دەکەن،واتە دەبینین ئەو رۆژانی حوکمڕانییە لەناو خەڵکدا دەستاودەستیان پێ دەکرێ . لەڕاستیدا: ئەوەی کە ئەمڕۆ دۆڕاندی گەلی عیراق بوو کە سەرەڕای هەموو ئەو هەوڵە گەورەیەی لە رووی سەربازی و سیاسی و داراییەوە بۆی فەراهەم کرا نەیتوانی بونیادنانی دیموکراسی لە عیراقدا تەواو بکات. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا پاشەڕۆژ هەر لە بەرژەوەندیی گەلی عیراقە.زاڵبوونی دیموکراتەکانیش بەسەر کۆنگرێسدا بە مانای زاڵبوونی رێکخراوی قاعیدە و ئوسامە بن لادن نییە بەسەر کۆنگرێسدا. گۆڕینی رامسفێڵد-یش بە رۆبەرت گیتس بە مانای گۆڕینی رامسفێڵد نییە بە مستەفا تەلاس.ئەمریکا هەر هەموویان لەسەر رزگارکردنی عیراق رێکن. دڵخۆشیی هەندێ عەرەبیش بە دۆڕانی کۆمارییەکان و بردنەوەی دیموکراتەکان وەك دڵخۆشیی ئەو ناحاڵییە قڕهەڵوەریوەیە کە شانازی بە قژی دراوسێکەیەوە دەکات.عەرەبیش ئەو ناحاڵییانەن کە بە ئومێدی سەرلەنوێ گەڕانەوەی رژێمی دیکتاتۆرین بۆ عیراق لە میانەی دەرگای دیموکراتەکانی ئەمریکاوە. ئەوانە لە گێژ و وێژەکانی عەرەبن کە چەندین ساڵ و بۆ چەندین خولی هەڵبژاردنی یەك لەدوای یەك، جارێك بە هیوای بردنەوەی دیموکراتەکانن و جارێکی تریش بردنەوەی کۆمارییەکان بەو ئومێدەی یەکێك لەم دوو پارتە بەشێوەیەکی کۆتایی بچنەسەر دۆزی

فەلەستین و چارەسەری بکەن، ئیدی ئەوەیان ڕەچاو نەکردبوو و ناکەن کە ئەمریکا لە ئاست ئیسرائیل و لە ئاست دۆزە عەرەبییەکاندا یەك ستراتیژی هەیە. ئەم ستراتیژەش بریتییە لە تەنها یەك دەرگا، بەلام بە دوو دیودا، دیوێکی دیموکراتی و دیوێکی کۆماری. هێشتا عەرەب باوەڕیشیان وایە کە گۆڕانی ئیدارەکانی ئەمریکا بە مانای گۆڕانە لە ستراتیژییەتی دەرەکیی ئەمریکادا. لەم ڕووەوە " دامەزراوەی زوغبی" بۆ ڕاپرسیکردنی ڕای گشتیی ئەمریکا، لە ئۆکتۆبەری ڕابردوودا ئەنجامی ڕاپرسییەکی بلاوکردۆتەوە کە لەسەر عەرەبی ناو ئەمریکا کردوویەتی، بە ڕوونی دەرکەوتووە کە لەو چوار ویلایەتەی ڕاپرسییەکە گرتوونیەتییەوە، عەرەب پالێوراوە "دیموکراتییەکان"یان پێ باشە، لە ئەنجوومەنی نوێنەراندا بێت یان ئەنجوومەنی پیران، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە لە خولەکانی پێشوودا دیموکراتەکانیان هەڵبژارد و ئەنجامگەلێکی رازیکەریان دەست نەکەوت.ئەوەی کە سەیریشە ئەوەیە ئەو عەرەبانەی کە چاوەڕێی گۆڕانێك لە سیاسەتی ئەمریکادا دەکەن لە ئاست چەندین دۆزی عەرەبیدا و لە سەرویانەوە دۆزی فەلەستین،بۆ خۆیان گۆڕانیان بەسەردا نەهاتووە و هاوشانی گۆڕانکارییە سیاسییەکانی جیهان لە سەر ئاستی هەرێمایەتی یان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، نەڕۆیشتوون. بەو گۆڕانکارییانەش بە ئاگا نەهاتنەوە تەنها لەو دەمەدا نەبێت کە ئاگر دەستی بە سوتاندنی جل و بەرگ و ماڵەکانیان کرد وەك ئەوەی دوێنێ لەگەڵ حەماس-دا ڕوویدا، ئەو حەماسەی کە لە هەشت مانگی ڕابردوودا کە حوکمی تیادا گرتە دەست گۆڕان-ی ڕەتکردەوە تا ئاگرە بە تینەکە لێی نزیك بووەوە و ئیدی درکی بەوە کرد کە میساق و دروشمەکانی بۆ فەلەستینییەکان ماڵوێرانکەرن و، ئیسماعیل هەنیە-ش کەوتە ئەوەی ڕایبگەیەنێ کە لە پێناوی هەڵگرتنی

ئابلۆقە لەسەر گەلی فەلەستین دەست لە سەرۆکایەتی وەزیرانی فەلەستینی دەکێشێتەوە، بەلام وەك دەلێن : دوای ئەوەی کار لەکار ترازا). هەروا حزبی بەعسیش لە عیراقدا درکیان بەوە نەکردبوو کە حزبێکی دیکتاتۆرین و دژبەگەلی عیراق و گەلی کورد و هەموو پرەنسیپە مرۆڤایەتییەکانی ئازادی و دیموکراسین تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە ئاگر گەیشتە جل و بەرگیان و لەوە گەیشتن کە ئەوان لە رابردوودا بزنەکێویگەلێك بوون و سەریان بە تاوێرە بەردەکاندا دەدا، حالیان وەك حالی ئەوانەی کە شاعیر پێیاندا دەلێ:

*وەك ئەوەی کە بە تاوێرە بەردێکدا بەدا بۆ ئەوەی لاوازی بکا زیانی پێ نەگەیاند و شاخی بزنە کێوییەکەیش لاوازبوو*

ئەمرۆ عەرەب هەر بەم عەقلیەتەش مامەلە لەگەل بڕیاری دادگای عیراقی لە ئاست سەدام و داروودەستەکەیدا، دەکا. هەر بەم عەقلییەتەشەوە تەگبیری تەواوی دۆزەکانی خۆی کردووە لە رابردوودا.

ئەو پرسیارەش کە ئاراستەی ئەو عەرەبانە دەکرێت کە ناڕازین و لارییان لە لە سێدارەدانی سەدام هەیە، لە بابەت پارێزەران و رۆشنبیران و میدیاییەکان و قازی و پیاوانی ئاینی و خەلکی تر، ئەوەیە:

*چیترتان لە سەدام دەویست کە بیکات زیاتر لەو تاوانانەی کە کردوونی بۆ ئەوەی دادگاییکردنەکەی و بڕیاری لەسێدەران بەسەریدا دادپەروەرانە بووایە؟

* ئایا ئەو هەموو تاوانەی کە گەورە و بچوك شایەتییان لەسەردا بەس نییە - کە پێویست بەوە ناکا دادگایەکیان لەسەر دابنرێ- تا بەس بێت بۆ ئەوەی حوکمی لەسێدارەدانی بەسەدا بدرێت؟

* يان عەرەب لە فەرمانڕەوای خۆیان ڕاناپەڕن تەنانەت گەر كفری خواش بكەن وەك كۆمەڵێك لە شێخانی موسڵمانی عەرەب وتیان و فتوایان بۆ دا، لە سەروویانەوە شێخی سعودی ئەحمەد بن عسێمن ؟ .

# سوود و زیانەکانی هەڵواسینی سەدام

**ـ ١ ـ**

ڕەنگە هەندێ کەس وای دابنێن ئەم وتارە، وەك توانجێك، لەسەر ئەو نەرێ و ئەرێیانەی کە لە هەڵواسینی سەدام حسێن بەر لە نزیکەی مانگێك، کەوتنەوە، وتارێکی درەنگوەخت بێت، من بەمەبەستەوە بە درێژایی ئەو ماوەیە چاوەڕوان بووم تاوەکو هەموو ئەوەی کە لەبارەی ئەم ڕووداوە بێ وێنەیەوە، بێ وێنە لەمێژووی عەرەب، وتران، بە تەواوی وەربگرم و، بۆ ئەوەی خوێنەری مامەڵەکردووش لەگەڵ ئەم ڕووداوەدا وەستان و تێڕامانی زیاتر بێت و بە عەقڵ بیری لێ بکاتەوە نەك بە سۆز دوای ئەوەی کە ئاگری ئەم ڕووداوە کە بە ڕاستی نەك بۆ عەرەب و موسڵمانە سۆزدارەکان، بەڵکو بۆ ڕۆژئاواییە عەقڵانییەکان و تەنانەت دوژمنانی سەدام و ئەوانەش کە ڕقیان لێیەتی، ڕووداوێکی ورووژێنەربوو.

## — ٢ —

وا دیاره دەستەواژەی ( هەڵواسینی سەدام ) لە ئەدەبیاتی سیاسیی عەرەبیدا دەستەواژەیەکی قێزەوەن بێت. کێ خەوی وای دەبینی یان خەیاڵی لەوە دەکردەوە کە فەرمانڕەوایەکی ستەمکاری عەرەبیی وەك سەدام هەڵبواسرێت؟. بە درێژایی مێژوو هەندێ لە فەرمانڕەوایانی عەرەب بە فێڵ و ناهەقی و تیرۆرکردن یان لەسەر جێ مردوون. بەڵام لە مێژووی عەرەبدا و لە فەرهەنگە سیاسییەکانیاندا نەبووە کە فەرمانڕەوایەك بەو شێوە دادگایی بکرێت کە سەدام حسێن ـ ی پێ دادگایی کرا و هەڵیشیواسن بەو شێوەیەی کە ئەو هەڵواسرا، ئەمەش یەکێکە لە خەسڵەتەکانی سەردەمی نوێی عیراق کە لە مەودای دووردا سوودی بە عیراق گەیاند و لە مەودای کورتیشدا کەمێك زیانی پێ گەیاند.

## — ٣ —

پەتی هەڵواسین کە سەدام ـ ی پێ لە سێدارەدرا و هەر کەسێکی تریش کە لەگەڵیدان، وەك بەرزان و بەندەر، لەوەدا بەسوود بوو کە بە عیراقییەکانی وت: ئەم سەردەمە سەردەمی هەق و دادپەروەری و سزایە بۆ ئەوەی کە شایەنی سزادانە و، هیچ کەسێکیش ناتوانێ لە سزا هەڵبێت تەنانەت دوای ئەم ڕووداوەش. نکۆڵیش لەوە ناکەین ـ ئەگەرچی ئەم داننانە داننانێکی تاڵ و ئازاربەخشە ـ لەوەی کە ئەمریکا ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە پەسەندکردنی ئەو دادپەروەرییە و ئەو هەق و سزایەی کە بەو جۆرە بەڕێوەچوو. ئەگەر ڕۆڵی ئەمریکاش نەبوایە ئەوە سەدام بە تۆپینی سەگەکان دەمرد و، لە

گۆڕەپـانی فردەوســدا بەشــێوە دەرکــەوتووە زانراوەکــە و وەك ســەردەمی پاشایەتی ئەکرا بە پەتەوە و رائەکێشرا. ئەوە ئەمریکا بوو کە پێی لەسەر داگایی کردنی سەدام داگرت، بەڵام پێی لەسەر کات و ساتی هەڵواسینەکەی دانەگرت بەو جۆرەی کە جێبەجێکرا وەك دواتر زانیمان.

— ٤ —

هەروەها ئەم پەتی هەڵواسینە لەوەدا سوودی بۆ عیراق هەبوو کە ڕێی لە هـەموو کەسێك گـرت کـە گـرەوی لەسـەر گەڕانـەوەی سـەدام دەکـرد بـۆ حـوکمڕانێتی. هـەروەك ئـان بالبـاوم . یـش لـە وتارەکـەی لـە ڕۆژنامـەی (واشـنتۆن پۆسـت)دا وتـی: لـە سـێدارەدانی سـەدام حـسێن کاریگەرییـەکی باشی دەبێت لەسەر سیاسەتی عیراقی. ئەگەر هەر هیچ شتێکی باشیشی لێ نەکەوێتـەوە ئـەوە بـە تـەنها ئـەوە بەسە کە بۆ هـەتا هەتایە هـەر خـەونێکی بەعسییەکان لەبار دەبات لە هەر تۆڵەکردنەوەیەکدا کە سـەدام بەڕێوەی ببـات بۆ گەڕانەوە بۆ حوکمڕانێتی، ئەو خەونەی کە پێدەچوو سـەدام خـۆی پیـادا هەڵواسیبێ، چونکە سەدام، وەك شایەتحاڵەکان دەیڵێن، بە سەرسـوڕمانێکی گەورەوە لەو حوکمە سەری سوڕما کە بۆ لە سێدارەدانی دەرچوو.

— ٥ —

پــەتی هەڵواسـین لــەوەدا ســوودی بــە عـیراق گەیانــد کــە سیــستمی دادگـەریی عـیراق–ی بـەهێزکرد و بـووە پـشتیوان بـۆی. ئـەو ئـارەزووەی ئیدارەی ئەمریکا ـ شی بەدی هێنا کە خۆی لـەوەدا دەنوێنێ کە حکومـەتی

عیراقی وا پیشان بدات وەك ئەوەی حکومەتێکە توانای بەڕێوەبردنی وڵات و حوکمڕانیکردنی هەیە. هەروەك برۆنوین ماکدۆس دەڵێ، واشی لە عیراق کرد بە یاسا حوکمڕانی بکرێت. لەم رووەوە ئەمریکا ئارەزووی ئەوەی نەدەکرد کە دادگا لە چاوی عیراقییەکاندا بە تەواوی بە دادگایەکی ئەمریکی دەربکەوێت و، ویستی تامێکی عیراقییانەی بخاتەسەر. ئەگەرچیش حوکمی لە سێدارەدان لە عیراق لە میانەی حوکمی بۆل برێمەر . ی فەرمانڕەوای مەدەنیی ئەمریکادا هەڵوەشێنراوە، بەڵام حکومەتی عیراق سەرلەنوێ گەڕایەوە سەر کارپێکردنی. برۆنوێن ماکدۆس جەخت لەسەر هەمان ئەو قسەیە دەکاتەوە کە ئان ئابلباوم وتوویەتی، واتە لە سێدارەدانی سەدام هەموو هیوایەکی سوننە بە سەرلەنوێ گەڕانەوە بۆ حوکمڕانیکردنی عیراق دەسڕێتەوە. ئەمەش بەمانا ئەوەیە کە چیدی سوننە بەو شێوازەی کە پێشتر هەبوو ناگەڕێتەوە بۆ حوکمڕانیکردنی عیراق.

**ـ ٦ ـ**

هەرچی ئەو زیانانەن کە لە ئەنجامی هەڵواسینی ستەمکاری پێشوودا ( سەدام حسێن) بە عیراق گەیشت، ئەوە خۆیان لەوەدا دەبیننەوە کە کردەوەکانی توندوتیژی و کوشتار و تەقینەوەی ئوتۆمبێلە بۆمبڕێژکراوەکانیان زیاتر کرد. ئەمەش دەرئەنجامێکی بێ شك و بە دوور نەزانراوە لە دۆخێکی وەك دۆخی عیراقدا و لە هەلومەرجێکی وەك هەلومەرجی جیهانی عەرەبی و شەقامی سۆزداری عەرەبی کە لەلایەن پارتە سیاسییە ئاینی و ناسیۆنالیستەکان بە تایبەتیش بەعسییەکانەوە سۆزێکی ئەوتۆی لە ئاست ئەو رووداوەدا نواند پێشتر شتی وا رووی نەداوە. لەم

رووەوە، لە ئوردن خۆپیشاندانێکی بە گوڕ بەڕێوەچوو کە وێنەکانی سەدامی ستەمکاری تیادا بەرزکرابووەوە و، محەمەد ئەلعەوران - ی وەزیری پەرەپێدانی سیاسیی ئێستا لە حکومەتی ئوردن بەڕێوەی دەبرد. هەروەها لە پەرلەمانی ئوردندا سەرەخۆشی و فاتیحە خوێندنەوە بۆ گیانی سەدامی ستەمکاری پێشوو ئەنجامدرا. ئەم پەرلەمانەش تاقە پەرلەمانە لە جیهاندا کە تەحەدای هەست وسۆزی گەلی عیراقی بە عەرەب و کورد و نەژادە جیاوازەکانی ترەوە کردو ئەم کردەوە دزێوە رێورەسمە قێزەوەنە بێ پاساوەی ئەنجامدا. ئەمەش بێگومان کارێکی رێپێدراوە و بە رەزامەندی و رازیبوونی دەوڵەتی ئوردن بووە کە رێی داوە بە وەزیرێکی فەرمیی خۆی. کە دەشێت نوێنەری ئەو بووبێت لەو رێپێوانەدا - رێپێوانێکی نابڕوبەری لەو جۆرە بەڕێوەبەرێت. هەروەها دەوڵەتە نەك حکومەت، واتە کۆشکی پاشایەتی و سەرگەورەی کۆشکە کە رێی بە ئەنجومەنی نوێنەران داوە - کە ئەنجومەنی دەوڵەتە نەك ئەنجومەنی میللەت بێت - بەم رێوڕەسمە خەجاڵەتکەر و نابڕوبەرە هەستێت و تەحەدای هەست و سۆزی گەلی عیراق بکات لە سەرتاسەری جیهاندا.

— ٧ —

ئەم هەڵواسینەی سەدام زیانی لە دۆخی سوننە - ش دا لەعیراق، بەتایبەتی کە کەسی هەڵواسراو لە سوننەیە. سوننە بە کاروکردەوەی خۆیان و خەڵکی تریش هەست بەبێبەشی و ستەم دەکەن تەنانەت لەو سەردەمە تازەیەشدا. لەم رووەوە، بە درێژایی ئەو ماوەیەی رابردوو، ئەمریکا حکومەتی عیراق - ی هاندەدا لەسەر خەرجکردنی پارەپولی زیاتر

بۆ پرۆژه خزمەتگوزارییە جیاجیاکان لە پارێزگا سوننەنشینەکاندا، بەڵام تێبینی کراوە زۆربەی ئەو بڕە پارانەی کە ـ بۆ نموونە ـ بۆ پارێزگای ئەنباری سوننەنشین تەرخان کراون، هیچ کات خەرج نەکراون. هەر ئەوەش بوو کە بەرهەڵستکارێتیی سوننەی بۆ حکومەتی عیراق لە بەغدا گەرم کرد، ئەمە جگە لە ئاستەنگ دروستکردنی لەبەردەم ئەو کۆششانەی کە بۆ لەناوبردنی یاخیبوون دەدرێن لەناوچە سوننەنشینەکاندا.

— ٨ —

هەروەها پەتی هەڵواسین زیانی لە عیراق ـ دا لەوەی کە زۆرێك وایان مەزەندە کرد کە حکومەت پاڵێکی بەهێز بەمیلیشیا شیعییەکانەوە دەنێ بۆ بەردەوامبوونیان لەسەر چەوساندنەوەی سوننە بەو پێیەی کە بە کردەوە وای لێ هاتووە شیعە دەسەڵاتدارە نەك خەڵکی دی، بە تایبەتی کە هەڵواسینی سەدام لە بەرەبەیانی رۆژی جەژنی قورباندا و ئەو دەستەواژە ئاینییانەی کە تێی کەوت، وا لەقەڵەمدرا کە کارێکی تەواو شیعەییانەیە، کارێك کە وای لە شەقامی سوننی لەعیراق و لە جیهانی عەرەبی کرد وای دابنێت پرۆسەی هەڵواسینەکە و کاتەکەی، ئەو کاتە ئاینییە نەشازە، بە پرۆسەیەکی زیاتر سیاسی ببینێت تا دادگەری، شیعەییانە ببینێت تا عیراقییانە.

## — ٩ —

ئەو پرسیارەی کە ئێستا خۆی دەسەپێنێ ئەوەیە :-

ئایا ئەمریکا لە هەموو ئەوەی روویدا سەبارەت بە گرتنی سەدام و دادگاییکردنی و هەڵواسینی، هەڵەی کرد؟

ماکس هایستنگ لە رۆژنامەی ( گاردیان)ی بەریتانیدا دەڵێ: هەڵە هەرە گەورەکەی ئەمریکا دەستگیرکردنی سەدام حسێن بوو. لە ساڵی ١٩٤٤دا پەرلەمانتارانی بەریتانیا لە ئەنتۆنی ئایدن ـ ی وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەیان پرسی لە بارەی سروشتی ئەو ئاگادارییانەی کە درابوون بە سەربازە بەریتانییەکان لەحاڵەتی رووبەڕووبونەوەیاندا لەگەڵ هیتلەر، ئایدن هیچی پێ نەبوو جگە لەوەی لە ناو پێکەنینی پەرلەمانتاراندا وەڵامیدایەوەو وتی: من قەناعەتم بەوەیە کە ئەو بڕیارە بۆ ئەو سەربازە بەریتانییە بە جێ بهێڵرێت کە رێکەوتی ئەو هەڵوێستە دەکات .. لە ناو رابەرانی هێزەکانی هاوپەیمانانیشدا ئەوە تەنها ستالین بوو کە ویستی هیتلەر بە زیندوێتی دەستگیر بکا و چێژ لە هەڵواسینی ببینێ، هەرچی ئەوانی تر بوون هاواریان لەو کاریگەریی خراپانە دەکرد کە دەشێت لەئەنجامدانی هەڵواسینی سەرۆکی دەوڵەتێك بکەونەوە. بەڵام خۆکوشتنی هیتلەر وەك رزگارگەرێك بوو بۆیان لەو تەڵەزگەیە.

لە دادگاییکردنەکانی نۆرمبێرگیشدا کە یاریدەدەرانی هیتلەر ـ ی گرتەوە، هەمووان نائاسوودە بوون، چونکە ئەو شتەیان پەیڕەو دەکرد کە بە ( دادپەروەری براوە/ سەرکەوتوو) دەناسرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دانیشتنەکانی دادگاییکردنەکان سوودی خۆیان لە تۆمارکردنی واقعەکانی هەندێ لە تاوانە خراپەکانی نازییەت و دیکیۆمێنتکردنیان بۆ نەوەکانی داهاتوو، دوپات کردەوە.

# دوایین ماچی ئەمریکا بۆ عیراق

**ـ ١ ـ**

لە هەفتەی رابردوودا ئەو تاقیکردنەوە گران و سەختەم بینی کە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (( کۆندالیزا رایس )) لە کۆنگرێسدا رووبەڕووی بووەوە کاتێك کە لە ئاست دۆخی عیراق و پلانە تازەکەی سەرۆك بۆش لەبارەی عیراقەوە شایەتیی دا. بە راستیش لەو هاڕینە دیبلۆماسییەی کە رایس لەلایەن هەڵۆ دیموکراتەکان و کۆمارییەکانەوە پێکەوە لە ئەنجومەنی پیراندا، رووبەڕووی بووەوە، بەزەییم بە حاڵی ئەم خانمە ناسکە دەهاتەوە. ئەوان کۆمەڵە پرسیارێکیان بەسەردا باراند کە بە پوختی و بە دڵڕەقییەکی توندەوە، بریتی بوو لەوەی: هەتا ئێستا چیتان بە عیراق کردووە؟ حکومەتی مالکی تا ئێستا چی شتێکی لەو بەڵێنانە هێناوەتە دی کە پێی دان؟ بۆچی بڕیارتاندا ٢٠ هەزار سەرباز بنێرن بۆ عیراق، ئەرکی ئەم سەربازانە چییە، ئەو دەسکەوتەش چییە کە لێیان دەخوازرێ و، چۆن رێگەش لە دەستێوەردانی ئێران و سوریا دەگرن لە عیراقدا ؟؟؟ .. ئەوانە و پرسیاری

تریش كه وه‌لامه‌كانیان قورس و گرانن، قورس و گران به‌و راده‌یه‌ی كه من به چاوی به‌زه‌ییه‌وه ده‌مڕوانییه وه‌زیری ده‌ره‌وه، ئه‌و وه‌زیره‌ی كه ده‌تووت چۆله‌كه‌یه‌كی پاساریی ناو دارستانه به تایبه‌ت كه ڕاوچییه‌كان له هه‌موو لایه‌كه‌وه ده‌وره‌یان لیٚ دا و، هه‌مووان فیشه‌كیان پێوه ده‌نا، ئه‌مه‌ش نه‌ك بۆ ئه‌وه‌ی سووری بكه‌نه‌وه یان بیخۆن، به‌ڵكو بۆ ئه‌وه‌ی شێره لێراكشاوه‌ی كۆشكی سپی ده‌نگی فیشه یه‌ك له دوای یه‌كه‌كان ببیستیٚ به‌و ئومێده‌ی له خه‌ڵوه‌ته قووڵه‌كه‌ی به ئاگا بێته‌وه.

— ٢ —

ئایا پلانه تازه‌كه‌ی ئه‌مریكا ئاسایش و سه‌قامگیریی خوازراو بۆ عیراق دێنێته دی؟ له‌م ڕووه‌وه، له هه‌فته‌ی ڕابردوودا جه‌لال تاڵه‌بانی -ی سه‌رۆك كۆمار، هاواری ئه‌وه‌ی بۆ عیراقییه‌كان و بۆ عه‌ره‌ب و بۆ ئه‌مریكا و بۆ هه‌موو جیهان كرد و به ڕاشكاوی و ئازایه‌تییه به‌رچاوه‌كه‌ی خۆی ووتی : ((كه‌س كێشه‌كانی عیراق چاره‌سه‌ر ناكات عیراقییه‌كان خۆیان نه‌بن، ئه‌وه‌ی كه له عیراقیشدا ڕووده‌دات كێشه‌یه‌كی عیراقییه و كه‌وتۆته ئه‌ستۆی عیراقییه‌كان خۆیان و كه‌سی تر نا )) . ئه‌مه‌ش كرۆكی مه‌سه‌له‌كه‌یه، هه‌ر ئه‌مه‌شه كه به‌م دواییانه ئیداره‌ی ئه‌مریكا و له چوارچێوه‌ی پلانه تازه‌كه‌یدا دركی پیٚ كردووه كه به پێی ئه‌و پلانه‌ش كار بۆ ئه‌وه ده‌كات ته‌واوی كاروباری عیراق بداته‌وه ده‌ستی عیراقییه‌كان خۆیان و خۆیشی له سه‌ربازگه و پێگه‌كانیدا لێی بكه‌ویٚ و چاودێری ‌باروده‌خه بكات. پرسیاریش ئه‌وه‌یه : ئایا عیراقییه‌كان ئاماده‌باشن بۆ ئه‌وه‌ی كاروباری خۆیان له ئه‌ستۆ بگرن؟ ئایا گه‌یشتوونه‌ته ته‌مه‌نی پێگه‌یشتنی سیاسی و هۆشیاریی نیشتمانییانه‌ی

ئەوتۆ بەو جۆرەی کە دەستبەرداری بەرژەوەندییە شەخسییەکانیان و بەرژەوەندیی تایەفەکانیان بن و، لە پێناوی بەرژەوەندییەکانی نیشتمان و بەرژەوەندییەکانی گەلی عیراق هەر هەمووی، تێیان پەڕێنن؟

ئایا مادەیەکی بێهۆشکەری جادوییانە هەیە کە ئەمریکا دەرخواردی سیاسییەکانی عیراقی بدا تاوەکو کەسی شیعە مەزهەب شیعەیەتیی خۆی لە بیر بچێ و بزانێ کە ئەو تەنها عیراقییە و، سوننە مەزهەبێکیش سوننەیەتیی خۆی لە یاد بکا و وەکو عیراقییەك بژی و، ئەودوای تایەفە و نەژادەکانی تری عیراقیش بە هەمان شێوە؟..

— ٣ —

ئەوەی بە درێژایی چوار ساڵی رابردوو، هەر لە بەرە بەیانی ٩ ی نیسانی ٢٠٠٣ەوە هەتا ئێستا، بینیمان، ئەوەیە کە، دەستەبژێر-ی سیاسیی عیراق ئەوەی لە بیرکردووە کە عیراقییە. ئەو هاتووە لە پێناوی ئەوەی کە سەرلەنوێ عیراق بونیادبنێتەوە ، بۆیە ئەم دەستەبژێرە کەوتە راگەیاندنی شیعێتی و سوننێتی خۆی‌و عیراقیش بەو جۆرە بونیاد دەنێتەوە بۆ خۆی کە خۆی دەیەوێت نەك بەو شێوەیەی هەموو گەلی عیراق دەیەوێت.

ئەوەی کە لەو چوار ساڵەی دواییدا بینیمان ئەوەیە کە ڤایرۆسی تایەفەگەری و مەزهەبگەرایی-یش، کە لە سەردەمی بەستەڵەکی دیکتاتۆریدا نوستبوو، بێدار بووەوە و، لە کەشوهەوای ئازادی و دیموکراسیی گەرم و گوڕدا، کە زەمینە بۆ ئەم جۆرە ڤایرۆسانە خۆشدەکەن، دەستی بە چالاکی و بڵاوبوونەوە کردەوە.

ئـەوەی کـە هـەر لـەو چـوار سـاڵەی دوایـیـدا بینیمـان ئەوەشـە کـە، دەستەبژێرە سیاسییەکان پارەوپولی عیراقیان دزی، ئەمە لەجیاتی ئەوەی پارەوپوولی دزراوی سەردەمی بەستەڵەکی دیکتاتۆری بۆ عیراق بگێڕنەوە کە بەشێکی زۆری لە میانەی ئەو پارەوپولە زۆرو زەوەندەدا دەرکەوت کە بۆ سەدان لـە پـارێزەرانی بـەکرێگیراوی دەسـتەی بـەرگریکردن لـە سـەدامی ستەمکار خەرج کرابوون، ئەو ستەمکارەی کە ڕۆیشت و بەسەرچوو.

ئەوەی هەر لەو چوار ساڵەی رابردوودا بینیمان ئەوەیە کە، دەستەبژێری سیاسیی عیراق لایەنگیریشی بۆ عیراق نەبوو ئەوەندەی کە بۆ ئیران، یان سوریا، یان ڕێکخراوی قاعیدە، یان بۆ لایەنی دیکەی بوو، ئەمە بە جۆرێك کە عیراق لەسایەی سەری ئەم دەستەبژێرە سیاسییەوە بۆتە سەرزەمینی ململانـێ چـەکدارییەکان، ئـەو ململانێیانـەی کـە لـە بەرژەوەنـدیی چـەند لایەنێکی دەرەکیدا ئیش دەکەن. هـەروەها عیراق وای لێهاتووە بریتییە لە قوربانییەك کە گورگی دارستانەکانی دەوروبەر گاز و قەپاڵی خۆیـانی لـێ دەگرن، کارێك کە پاڵی بە موعەمەر ئەلقەزافیەوە نا تەحەدای زیاتر لە ١٥ ملیۆن عیراقی بکات و، سوکایەتی بە سەدان هەزار لەو خێزانی قوربانیانە بکا کە سەدام کوشتوونی و، لە پاڵ پەیکەری عومەر موختاردا پەیکەرێکی یادگاری بۆ سەدامی ستەمکاریش دروست بکات. ئا بەو جۆرەش عیراق وای لێهات ئابڕوی شکێنرا و لاواز و بێ نەوا بوو و، ڕێك وەك ئەوەی منداڵێکی هەتیو و ئاوارەکراوبێ و باوکی نەبێ.

پلانی تازەی ئەمریکا بۆ چارەسەرکردنی باردۆخەکە لە عیراقدا پلانێکی جادووییانــە نییــە، بــە ریمــۆتی کــۆنترۆڵیش ئــیش ناکــا تــاوەکو لــە چاوتروکانێکدا وێستگەیەك سەرەوژێر بکا و وێستگەیەکی دیکە بهێنێ.
پلانی تازەی ئەمریکا پلانێکی کوێرە و واقعی عیراقی، وەك ئەوەی پێویستە ببینـرێ، نەبینیوە. ئەم پلانە پلانێکی عـەرەبیی تەقلیدییـە زیـاتر لـەوەی پلانێکی ئەمریکی بێت. واتە پلانی ( ماچکردنی ریش)ی سوننەی عیراق و لێسانەوەی پــرت و پیــسییان و ماچــکردنی دەســتەکانیان و داواکردنــی رەزامەندی و لێبووردەییانەیە، ئەمە لە پاداشتی ئەوەی کە سوننە بەسـەر عیراقیدا هێنـاوە: بەو چاکە کوشندەیەی نواندیان کە خۆی لـە شەڕکردنی دیموکراسیدا دەبینێتەوە و، لەوەی کە دیموکراسییان بە کوفر و بێ باوەڕی لەقەڵــەم دا و، تیرۆریــستانیان لــە ئــامێزگرت و، رێگــەیان نــەدا بــە خۆیــان بەشداریی هەڵبژاردنەکان بکەن و، کەوتنە شەڕکردنی دەستوور و، ناویان لە زەرقــاوی و سـەدام نــا ( گــەورەی شــەهیدان ) و، لەســەر داوای ســوریا-ش داوای کــشانەوەی دەســتبەجێی هێزەکــانی ئــەمریکا دەکــەن لــە عــیراق لەبەرامبـەر کشانەوەی سوریا لـە لوبنـان، واتـە یـەك بەیـەك و، کشانەوە بـە کشانەوە، ئیتر زاڵمتریش ئەو کەسەیە کە سەرەتا دەست پێدەکات.

پلانــی ئــەمریکا فوکردنیــشە بــە قــابێکی بــڕاودا، چــونکە چــاوی لەسەرچــاوەی راســتەقینەی تیرۆریــزم لــە عــیراق پۆشــی و هــەوڵی چارەسـەرکردنی کـردەوە تیرۆریستییەکانی تـەنها لـە نـاو عیراقـدا دا. ئێمـە لەمەوبەر وتومانە، تیرۆر حاڵی وەك حاڵی مێرووەکانی پیسکردن و مێرووە

ئازاربەخشەکانی دیکەیە و ئەگەر سەرچاوەکەیان لە ناو نەبەیت و ئەو ناوەڕۆ و گۆماوانەیان وشك نەکەیت کە هێلانەیان تیادا دەکەن و تیایاندا زیاد دەکەن ئەوە بەکارهێنانی دەرمانی مارومێروو لە دژیان سوودی نییە.

سەرچاوەی سەرەکیی تیرۆر لە عیراقدا، لای هەر کەسێك کە عەقڵی هەیە و، هەر یەکێك کە چاوی هەیە و، هەریەکێك کە دەبینێ و، لای گەورە و بچووك، بە پلەی یەکەم، ئیران و سوریا-یە. سوریا و ئێران شانسێکی گەورەشیان هەبوو کە خودا ئەمریکای ناردە پاڵیان بۆ ئەوەی لەسەر گۆڕەپانی عیراق تۆڵەی خۆیانی لێ بکەنەوە. لەم رووەوە، لە کوێ ئێران دەستی بگەشتبایە ئەمریکا تاوەکو تۆڵەی خۆی لێ بکاتەوە لە پای هەڵوێستی ئەمریکا لە دۆسییە ئەتۆمییەکەی ئەگەر ئەمریکا دراوسێی نەبووایە لە عیراق و نەکەوتبایەتە ژێر رەحمەتی دارەکەیەوە؟

ئەگەر ئەمریکا لە عیراقدا بوونی نەبووایە، لە کوێ-وە بۆ سوریاش ئەوە هەڵدەکەوت کە تۆڵە لە ئەمریکا بکاتەوە لە پای دەرکردنی لە لوبنان، ئەو دەرچوونە ئابڕوشکێنەی کە بەشار ئەسەد-ی کردە ئەو (ئەبا عەبدوڵلا ئەلسەغیر)ەی کە شکۆیەکی لە دەستدا باوباپیرانی بونیادیان نابوو. ئەو کەسەی کە فیردیناند و ئەزێبیلا لە ئەندەلوسدا وەدەریان نا و، وای لێهات لەسەر بەرزاییەکانی ( البادول )ەوە کە ناوی لێنرا ( التنهيدة العربي الأخيرة) بەسەر شکۆی باوباپیرانیدا دەگریا و، دایکیشی قسە بەناوبانگەکەی خۆی پێ دەووت: وەك ژن بەسەر موڵکێکدا بگری کە وەك پیاو نەتپاراست. بەشار ئەسەد-یش وەکو ژن بەسەر موڵکێکدا گریا کە وەکو پیاو نەیپاراست کاتێك کە ئیتر لە (( ئەندەلوس-ی لوبنان)) دەرچوو و موڵکێکی لە دەستدا کە باوکی بە درێژایی پتر لە ٣٠ ساڵ بوو، بونیادی نابوو.

کەواتە ئێران و سوریا بە میلیشیا عیراقییەکانیان شەڕ ناکەن، بەڵکو لە عیراقدا شەڕی ئەمریکییەکان دەکەن. لەم رووەوە حزبی بەعس لە عیراقدا کۆتایی هات و، بەعسی سوریاش هیوای بە حوکمێکی بەعسی نییە بۆ عیراق . هەروەها ئێرانیش هیوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئاینیی ئاخوندیی لە عیراقدا نییە بە تایبەتی لە سایەی بوونی ئەو ژمارە گەورەیە لە عیراقییە عەلمانییەکان، لە سەرویانەوە، کورد کە وەك دڕکێکی گەورە و برینداركەر لە هەڵقی دەوڵەتی ئاینیی عیراقدا دەوەستن ئیدی لە هەر لایەکەوە بێت، لای شیعەوە بێ یان لای سوننەوە، چونکە کورد زامنی گەورە و یەکەمن لە دژی باڵادەستبوونی پیاوانی ئاین بەسەر دەوڵەتی عیراقدا، ئەوەی کە کوردیش لە هەرێمی کوردستاندا کردوویانە لە جیاکردنەوەی تەواوەتیی نێوان ئاین و دەوڵەت و رێگرتن لە دروستبوونی پارتی ئاینی و دەستوەردانی پیاوانی ئاینی لە سیاسەت، ئەو شتەیە کە هیوادەخوازن لە هەموو عیراقی فیدراڵدا رووبدات.

— ٥ —

ئایا پلانی تازەی ئەمریکا و ناردنی زیاتر لە ٢٠ هەزار سەربازی تازە بۆ عیراق، دوا ماچی ئەمریکایە بۆ عیراق و دوای ئەوە ئیدی لێك جیابوونەوە روودەدات و ئەمریکا عیراقی لە دایکبوو لە ئامێزی خۆی رادەپەڕێنێ و بە مەمکە گەرم و نەرمەکانی شیری بەلاشی ناداتێ وەك لەو چوارساڵەی دواییدا کردی؟

لە ئاست توانای سیاسی و ئەمنیی عیراقدا هەموو ئەمریکا توشی نائومێدی و بێزار بوونە. ئەوە تەنها دیموکراتەکان نین، تەنها

کۆماریـەکانیش نـین، تـەنها دەسـتبەژێرە سیاسـییەکانیش نـین، بـەڵکو هاوڵاتیی ئاسایی ئەمریکییش بە دڵنیاییەوە ئەوە دەزانێ کە زیاتر لە سێ هەزار سەرباز لە عیراقدا مردوون و زیاتر لە بیست هـەزاریش بریندداربوون و زیـاتر لـە سـێ سـەد ملیـار دۆلاریـش خـەرج کـراوە کـە لـە پێنـاوی ئـازادیی عیراقدا نەبووە. ئازادیی عیراق ئەو هەموو قوربانییەی پێویست نییە، بەڵکو ئەو دۆڕانە ئەمریکییانە باجێك بووە کە ئەمریکا بۆ سوریا و ئێران-ی داوە. ئەگەر هەر لەسەرەتاشەوە دەستی سوریا وئێرانیان لەعیراقدا بڕیبایە؛ ئەوە ئـەمریکا ئـەو هـەموو باجـەی لـەپێناوی ئازادیی عیراقـدا نـەدەدا. ئـەو بیـست هـەزار سـەربازەش کەئـەمریکا بـۆ عیراقیـان دەنێرێـت رووبـەڕووی هـەمان چارەنووسـی بـەلاش دەبنـەوە ئەگـەربێت و ئـەمریکا کـاری سـەربازی و دیبلۆماسیی یەکلاکەرەوە لە دژی ئێران و سوریا ئەنجام نەدات.

# له ڕەچەتەی بیکەر- هاملتۆندا، کامەیە چارەسەر؟

— ١ —

بە بڵاوبوونەوەی ڕاپۆرتەکەی لیژنەی بیکەر - هاملتۆن، لەم ڕۆژانەدا خۆشییەکی گەورە جیهانی عەرەبیی گرتووە. عەرەب بە ڕاست و چەپ و ناوەڕاست، ئەم ڕاپۆرتەیان بۆ ئەمریکا بە نوشست و بۆ عەرەب بە سەرکەوتن لەقەڵەمدا، بە تایبەتی ئەو عەرەبانەی کە دژی داگیرکردنی عیراق وەستانەوە لە ٢٠٠٣دا، لەگەڵیدا یەك تێبینی هەیە کە ئەویش ئەوەیە، ئەم دڵخۆشبوونە بەر لە بڵاوکردنەوەی وردەکاریی ئەو ڕاپۆرتە بوو و بەرلەوەش بوو یەك عەرەب هەبێ یەك پیتی لەو ڕاپۆرتە خوێندبێتەوە. جا ئێمەی عەرەب هەروایین: شت ڕەت دەکەینەوە بەر لەوەی بیخوێنینەوە و، قبوڵی دەکەین بەر لەوەی تێ بگەین و، بەرهەڵستی دەکەین بەرلەوەی بزانین و، ڕەزامەندیشین بەرلەوەی لێك بدەینەوە. هەروەك تەها حسێن لە پتر لە نیو سەدەوە لە بارەمانەوە دەڵێ: ڕۆژئاوا دەخوێنێتەوە تا تێبگا، ئێمەش

تێدەگەین تا بخوێنینەوە! ئێمە وەك گەلانێکی عەرەبیی سەرەتایی، لە ئاست ئەویتر و بیروباوەڕی ئەویتردا هەڵوێستی پێشوەخت و ئامادەمان هەیە، ئەمەش لەژێر کاریگەریی ئەنگێزەی عەسەبییەتی خێڵەکێتیی عەرەبیدا کە ئیبن خەلدون لە ( المقدمة) بەناوبانگەکەیدا باسی لێکردووە، ئەو عەسەبییەتەی کە هێشتا بنەچەکەی تیاماندایەو چەندین نەوە لەلیبراڵیستەکان، لە جەمالەدین ئەفغانییەوە تا محەمەد ئەرەگۆن، نەیانتوانیووە بیسڕنەوە.

— ٢ —

نکۆڵی لەوە ناکەم کە ئەوەی لە ڕاپۆرتەکەی بیکەر - هاملتۆندا هاتووە بۆ ئیدارەی ئەمریکا و بۆ دەستەبژێرانی سیاسیی عیراقیش وەك یەك بە سوود بوو. بەڵام پێویستە جەخت لەوەش بکەینەوە کە ئەوەی لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە شتێکی تازە نییە، چونکە هەموومان درێغی کردنی ئەمریکا دەزانین لە عیراقدا و دەشزانین کە چۆن ئەمریکییەکان لە میانەی چوار ساڵی ڕابردوودا عیراقیان ( تەنها ناوەڕاست و باشوور) بەو منداڵە شیرەخۆرە نازپێدراوە لەقەڵەمدا کە نابێت ، وەك منداڵانی دی، لە دوای نۆ مانگ-ی لە شیری دایك بېڕدرێتەوە، بەڵکو ساڵانی شیرەخۆرێتیی ئەو بۆ سێ یان چوار ساڵ و ڕەنگە زیاتریش، درێژ بکرێتەوە، بەوەش ئەم منداڵە لە ئامێزی دایکیدا بمێنێتەوە و لە مەمکە گەرم و پڕەکانی شیربدرێت. دەستەبژێرانی سیاسی لە عیراق-یش، بەو دۆخە، کەوتنە نیعمەت و پشوو و دڵخۆشی و خۆنۆشییەوە و، وایان لێهات، بۆ بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان و بەدیهێنانی دەسکەوتە شەخسی و حزبییەکانیان لەسەر حسابی پاشەڕۆژی عیراق،

خۆیان پڕوکاند و، بەرژەوەندییەکانی نیشتمان و بەرپرسیارێتییەکانیان پشتگوێ خست. بۆیە کاتێك کە ئەمریکا بڕیاریدا ماوەی شیرەخۆری دیاری بکات و پەلە لە بڕینی بکات بە تایبەت کە شیرێکی ئەوتۆ لە مەمکەکانیدا نەما بەشی شیرەخۆری بکا و ئارامگرتنی دوور و درێژیشی پێ نەماوە، زۆربەی ئەو دەستەبژێرانە تۆقین و وروژان و تووڕەبوون.

— ٢ —

ئەوەی کە ڕاپۆرتەکە خۆی لێ غافڵ کردووە بەو ئەندازەیەی کە زۆرێك لە مسداقییەتی لەدەستداوە، باسنەکردنێتی لە دەسخەڕۆیی ئەمریکا و لاوازیی ئەمریکا و کەمتەرخەمیی ئەمریکا لە ئاست کانگاکانی تیرۆریزم لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لە ئاست هاتنی تیرۆریزم لە ڕێی سنوورەکانی عیراقەوە. هەمووشمان دەزانین کە ئەمریکا لەوەدا غافڵ بوو، یان نەیتوانی شتێك بکات کە مکوم و بەرگربێت بۆ وشککردن یان وێرانکردنی کانگاکانی تیرۆریزم نە لە عیراق و نە لەئەفغانستان و نە لە لوبنانیش. واتە ئەمریکا تەنها وەك سەیرکەرێك وەستاوە، سەیرکەرێك کە لێدوانی ئاوریشمینی هودهودییانە و هەرەشەئامێز لە سوریا و ئێران دەدا، ئەو دو وڵاتەی کە ئێستا دوو کانگاکەی تیرۆریزمن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. هەردووڵاشیان ئەو دوو سەرچاوەیەن کە تیرۆر بۆ تەواوی دەوڵەتانی ناوچەکە و لەسەرویانەوە عیراق و لوبنان و ناوچەکە دەنێرن. لەم ڕووەوە ڕۆژنامەی "السیاسة " ی کوەیتی ڕۆژی هەینی رابردوو ٢٠٠٦/١٢/٨ ڕاپۆرتێکی دووروودرێژی پەیامنێرەکەی خۆی لە لەندەن بڵاوکردۆتەوە، تیایدا باس لەوە دەکا کە چۆن ئێستا سوریا تیرۆریستان چەکدار دەکا و مەشقیان پێ

دەکا و بۆ عیراق و لوبنان و سعودییەیان دەنێرێ. هەروەها کۆمەڵێك ڕاپۆرتی جیاجیاش کە لە بەغدا و بەیروت و عەممانەوە دەرچوونە باس لە ڕۆڵی گەورەبووی ئێران دەکەن لە عیراقدا و، چۆنیش ئێران بە هاوکاری لەگەڵ سیاسییەکان و پیاوە سەربازییە عیراقییەکاندا عیراق وێران دەکات. بەشێوەیەکی ڕۆژانە. واتە، هەروەك پەندە عەرەبییە بەناوبانگەکە دەڵێ، هەریەك لە سوریا و ئێران: بە " فیل " یان بە " گوێدرێژی " ی ئەمریکا نەوێران، بۆیە کەوتنە کێبەرکێ لەسەر کورتانەکە ( واتە ئەو کورتانەی کە لەسەر پشتی گوێدرێژ دادەنرێت - وەرگێڕ). ئەوان نەیانتوانی لەسەر خاکی خۆی دەست لە ئەمریکا بوەشێنن هاتن لەسەر خاکی عیراق و هەروەها لوبنان، کەوتنە شەڕکردنی.

— ٤ —

لە دەرەوەی لەبەرچاوگرتنی بەرهەڵستکاریکردنی بەهێزی کورد بۆ ڕاپۆرتەکەی بیکەر - هاملتۆن لەبەر چەند هۆیەك کە هۆی بەجێن و ڕابەرە کوردەکان ڕوونیان کردۆتەوە و، لەسەر زاری مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستانیش و کامەران قەرەداغی وتەبێژی ڕەسمیی سەرۆك کۆماری عیراق جەلال تاڵەبانی — یەوە بە ووردی بۆ ڕای گشتییان شیکردۆتەوە. دوور لەبەرهەڵستکاریی کورد بۆ ئەو ڕاپۆرتە، ڕاپۆرتەکە، بەنیگایەکی گشتی، کەموکوڕیی تێدایە و تەواو نییە. ڕاپۆرتەکە باس لەناوەڕاست و باشوور دەکا بە تەنها و باس لەباکوری عیراق، کوردستانی عیراق، ناکا. لیژنەکە کە ئەو ڕاپۆرتەی ئامادەکردووە سەردانی هەرێمی کوردستانی نەکردووە و قسەشی لەگەڵ بەرپرسانی ئەوێدا نەکردووە و

ئاشنا نەبووە بە کێشەکانی ئەو هەرێمە و رابەر و بەرپرسەکانی کوردی لە ئامادەکردنی ئەو راپۆرتەدا بەشدارنەکردووە، بگرە ئەو نامەیەی کە مەسعود بارزانیی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بۆ جیمس بیکەر-ی نارد لەبارەی زۆر دۆز و مەسەلەوە کە بەلای هەرێمی کوردستانەوە گرنگن. رەچاو نەکراوەو لە راپۆرتەکەدا ئاماژەی پێ نەدراوە.

— ٥ —

راپۆرتەکەی بیکەر - هاملتۆن لەسەر دوو خاڵی بنچینەیی راوەستاوە کە ئەوانیش:-

١-مەشق پێکردنێکی باشتر بە هێزە چەکدارەکانی عیراق و هێزەکانی ئاسایشی عیراق، کە ئەمەش خواستێکی پێلێداگیراوە و شتێکی نوێی تیادا نییە، چونکە هەمووان هەست بەوە دەکەن کە هێزە چەکدارەکانی عیراق و هێزەکانی ئاسایش پێویستییان بە مەشق پێکردنی چڕوپڕی زیاتر و ، بە شتی تازە هەیە لە چەك و جبەخانە. بەڵام راپۆرتەکە ئەوەی لە بیرکردووە باسی بایەخی مەشق پێکردنی هێزە سیاسییەکانیش بکات لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردنی حوکمڕانی لە عیراقدا. لەم رووەوە چوارساڵ - ی رابردوو ئەوەیان سەلماند کە عیراق لە بەڕێوەبردنی حوکمڕانێتیدا ئەو دەستەبژێرە سیاسییە عەرەبە زیرەك و بلیمەتەی نییە، ئەوانەش کە لە عەرەبی سوننە و شیعە و لە ساڵانی رابردوودا حوکمڕانێتییان لە عیراقدا گرتۆتە دەست پێشتر حوکمڕانێتی دیموکراتییانەیان پیادە نەکردووە و، لە توانا بەرزی سیاسیشدا کەموکوڕیان هەیە. هەروەها ساڵانی رابردوو ئەوەشیان سەلماند کە، هەروەك کوفی ئەنان لەم رۆژانەدا ووتی، گەندەڵیی

سیاسی و دارایی لەناو دەستەبژێرە سیاسییەکاندا، لە ڕۆژگاری سەدامی ستەمکاری لەدەسەڵات لابراو، زیاتر بڵاوبۆتەوە. دیارە ئەمەش، بۆ وڵاتێکی وەکو عیراق، جێی سەرسوڕمان نییە، عیراقێک کە چەند سەدەیەکی دوورودرێژە لەژێر کۆلۆنیالیزم و دیکتاتۆریدا کەوتووەو ناتوانێ هەڵسێتەوە: لەسەردەمی داگیرکاریی عوسمانی بەسەر جیهانی عەرەبی و عیراقدا لەساڵی ١٥١٧، ئینجا داگیرکردنی عیراق لەساڵی ١٩١٤ لەلایەن بەریتانیاوە، ئینجا سەردەمی پاشایەتی لەساڵی ١٩٢١، ئینجا سەردەمی کۆماری لەساڵی ١٩٥٨، پاشان حوکمڕانیی بەعسییەکان لە ساڵی ١٩٦٣ کە درێژبووەوە تا گەیشتە ساڵی ٢٠٠٣. بە درێژایی ئەو سەردەمە دوورودرێژانەش بوار بەهێزە سیاسییە عیراقییە دیموکراتیخواز و ئازاد و پاك و نیشتیمانییەکان نەدراوە کە سەرهەڵ بدەن و پەروەردەبن و گەورەبن. لەم رووەوە، داپڵۆسین، چەوساندنەوە، زیندانیکردن و دوورخستنەوەی چرۆ سیاسییە نیشتیمانییە دیموکراتیخوازە عیراقییەکان، کەرەستە و سیماکانی ئەو سەردەمە رەشە بەسەرچووانە بوون.

٢-راپۆرتەکە داوای پێویستبوونی گرتنەبەری ستراتیژێکی دیبلۆماسیی بەهێز دەکا بۆ پرۆسەی ئازادیی عیراق. ئەم دەستەواژەیەش مانای ئەوەیە کە گفتوگۆ لەگەڵ سوریا و ئێراندا بکرێت، ئەو دوانەی کە، لە غیابی ئێشکگرانی عیراق و پاسەوانانیدا، ئێستا دوو گورگی دڕندەی سەرەکین لە عیراقدا. هەرچی جیمیس بیکەر-ی وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمریکایە کە خاوەنی دەستێکی باڵایە لە ئامادەکردنی ئەو راپۆرتەدا، ئەوە ناسراوە بەوەی کە لەوە دوورترە لە واقعبینیی سیاسییەوە نزیك بێت. بیکەر لە ئەمریکا خاوەنی ڕێبازێکی سیاسیی بەناوبانگە، ئەو ڕێبازەش لە یەکەم و دووەم و سێیەم و دواهەمیشیدا هەر ڕێبازی دیبلۆماسییە. بیکەر لە هەر

کـارێکی دیبلۆماسـیش کـە گرتبێتیـە دەسـت سـەرکەوتوو نـەبووە، لـە سـەرووییانەوە کێشەی نـاکۆکی لـە بیابـانی رۆژئـاوادا لـەنێوان مـەغریب و پۆلیساریۆدا کە بیکەر، بە بۆنـەی سـەرنەکەوتنییەوە، سـاڵی ٢٠٠٤ دەسـتی لەو کارە کێشایەوە. بیکەر لە مەسەلەی پەلاماردانی عیراق لەساڵی ٢٠٠٢دا لە یەکەمین بەرهەڵستکارانیش بوو. پێشتریش لە ئیدارەی بوشی باوکدا، کە سـەرکردایەتیی جـەنگی کەنـداوی ١٩٩١ ی کـرد، بیکـەر لـە یەکـەمین بەرهەڵـستکارانی پێـشڕەویکردنی سـەربازیی بـوو بـۆ بەغـدا و بـۆ لابردنـی سەدام حسێن لـەو کاتـەدا. هـەروەها بیکـەر لـە سـەردەمی ریگانـدا لـە سـاڵی ١٩٨٥ و لـە سـەردەمی بوشـی باوکـدا لـە سـاڵانی ١٩٨٩-١٩٩٢ وەزیـری بەرگری بوو. لـە میانـەی ئـەو دوو پۆسـتەشیدا، بیکەر لە پـشت دەسـتبڕینی کوردەوە بوو لەلایەن ئەمریکاوە لەو دەمەی کە کوردەکان لە ساڵی ١٩٨٨ دا لـە جەنگـدابوون لـە دژی سـەدامی سـتەمکار ـ ی لـەکارلابراو و، لـە پـشتی ئـەوەش کـە ئـەمریکا دەسـتیان لـێ بەربـداو کوردەکـان بـەجێ بهێڵـێ لـە هەڵەبجـەو ئامێـدی و بادینانــدا ببنــە نێـچیری گۆرگــەکانی سـەدام و وەحـشییەکانی و دەسـتوپێوەندە پیـسەکانی، هـەروەها شـکاندنی ناموسـی ژنانی کورد ـ یش بە فتوای شەرعیی لەلایەن شێخەکانی سوننە و فوقـەهای دەسەڵاتی لەکارلابراوی ئەو دەمە. ئەمریکییەکان لەوەشدا دەسـتی کوردیـان بڕی کاتێك رابەری خوالێخۆشبوو مستەفا بارزانی نامە بەناوبانگەکەی لە ١٩٧٢/٣/١٠دا بۆ سەرۆك کارتەر نارد و تیایدا وریایی ئـەوە دەدا کە کورد ڕووبەڕووی لەناوبردنێکی گشتگیر دەبێتـەوە، کەچـی کارتـەر وەڵامـی ئـەو نامەیە ناداتەوە، چونکە لەوکاتەدا پیلانی نێودەوڵەتی بۆ کورد لەلایەن شای ئێران و کارتەرەوە دارێژرابوو. هەروەها کاتێك ئەمریکا لەساڵی ١٩٨٨یشدا

دەستی کوردی بڕی و لە تاوانەکانی سەدامی ستەمکار لە کوردستان بێدەنگ بوو ، ئەوە بۆ رازیکردنی لە خۆباییبوونی سەدامی ستەمکاربوو.

ئەمڕۆش دەبینین بیکەر لە میانەی خەونە سەرنەکەوتووەکانی و وێناکردنە نائاساییەکانی و ئایدیالە سیاسییەکانی کە لەگەڵ ئەو گورگانەی چاویان بڕیوەتە نێچیری عیراق بێ سوودن، دێتەوە بۆ ئەوەی لە راپۆرتەکەیدا موژدەی چارەسەری جادویانەمان بۆ تەڵەزگەی عیراق بداتێ کە ئەویش موژدەی پێویستیی دەستپێکردنی گفتوگۆیە لەگەڵ سوریا و ئێراندا. لە کاتێکدا ئەو خۆی دەزانێت و بە دڵنیاییەوە دەزانێت کە سوریا بە هێورکردنەوەی دۆخی عیراق و دەستهەڵگرتنی خۆی لە عیراق رازی نابێت تەنها بە نرخێکی گران نەبێت کە ئەویش گەڕانەوەی سەربازییانە و سیاسییانە و ئابورییانەیەتی بۆ لوبنان وەك پێش ساڵی ۲۰۰۵، ئێرانیش دەست لە عیراق هەڵناگرێ تەنها بە بێدەنگیی تەواو و پراکتیکراوی ئەمریکا نەبێت لە پرۆژە ئەتۆمییەکەی کە بە وەدەستهێنانی بۆمبێکی ئەتۆمی کۆتایی دێت، ئەمەش، وەك لە وتارێکی پێشوومدا وتومە، بە ئەندازەی مەهدیی چاوەڕوانکراوە ( المهدي المنتظر ) .

جا ئایا ئەمریکا ئامادەیی ئەوەی تیایە ئەم باج و نرخە گرانانە بدات ؟

بە بێ ئەوەش، بێگومان راپۆرتەکە هەروەك مەرەکەبێك دەمێنێتەوە لە سەر کاغەز و کات بە فیڕۆ دەدات.

سا ئیدی کامەیە دەرمانی چارەسەرکەر لە رەچەتەی بیکەر هاملتۆندا..؟

# میوەی حەرامکراو ...

— ١ —

میدیای عەرەبی، بە هەموو ئامرازەکانییەوە، شەو و ڕۆژ لەوە ئاکەوێ باس لەپێویستیی پاشەکشەکردنی هێزەکانی ئەمریکا بکات لەعیراق بەو پێیەی ئەو هێزانە هێزی داگیرکەری سەربازین. ئەم بانگەوازە مدیای ڕۆژئاوا و بەتایبەتیش میدیای چەپەکان و میدیای ئەمریکی–ی سەربە ماشێنی میدیایی حزبی دیموکرات–یش دەیڵێنەوە. بنەما–یش لەم بانگەوازە یان ئارەزووەدا ئەوەیە کە: ئەو هێزانەی ئەمریکا کە ئێستا لە عیراقدان هێزی داگیرکەرن نەك هێزی ڕزگارکەر. ئەگەر بە هێزی ڕزگارکەریش دابنرانایە ئەوە هەموو ئەوانە داوای پاشەکشەی ئەو هێزانەیان نەدەکرد لەعیراق.

## ـ ٢ ـ

پێشتر چەندین جار لەچەندین ئامرازی میدیایی عەرەبی و بیانییەوە نوسیومانە کە عەرەب لەفەرهەنگی سیاسییاندا جیاوازی لە نێوان هێزی داگیرکەر و هێزی رزگارکەردا ناکەن. سەرەڕای ئەوەیش کە بڕیاری نەتەوەیەکگرتووەکان ئەوەیە کەهێزەکانی ئەمریکا لەعیراقدا هێزی داگیرکەرن، بەڵام ئێمە وای بۆ نەچین و ئەم بۆچوونەشمان دووپات دەکەینەوە کەئەم هێزانە هێزی رزگارکەرن و هاتوون لەپێناوی رزگارکردنی گەلی عیراق لەحوکمی حزبی بەعس و حوکمی ستەمکاری هەرمگەورەی بەعس سەدام حسێن. ئەگەر ئەم هۆکارەش نەبوایە ئەوە هێزەکانی ئەمریکا بەداوەتنامەیەکی ڕاشکاوانەی پێ لێداگیراوی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی نەدەهاتن، ئەو ئۆپۆزسیۆنەی کە سەدام حسێن ووردوخاشی کردن و سەرگەردانی کردن و ناوی نابوون (( سەگە لەرێدەرچووەکانی عیراق )) و لەمەنفاکان و دنیای پەرتەوازەی عیراقدا بەدوایانەوە بوو، ئەو دنیایەی کە لەسەروەختی ستەمکار-ی پێشوودا، ئەو پەرتەوازەییەی جولەکە کە لەمێژوودا بەناوبانگە، ئێش و ئازاری گەورەتر وسەختتربوو.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش، کەچی ئێمە هێشتا لافدەرانی بەخشندەیی و بەلێندان بە بەهەشت بە (( باوکی شەهیدان)) سەدام حسێن-ی ستەمکار دەبینین و دەبیستین کە لەو پیاوە ئاینییانەوەیە کە لەزێڕی سەدام و پاشان زێڕ و زیوی رەغد ـ ی کچی سوودمەندبوون و، لەو کادیرانەی حزبی بەعس ـ یش لەولاتی شام و یەمەن و میسر کە بەزێڕی سەدام دەحەسانەوە و

ئێستاش بەزیو ـ ی رەغدی کچی، کە تاقە وەسێتمەندی پەرستگا بەعسییە پیرۆزەکەیەتی، دەحەسێنەوە.

— ٢ —

بوونی هێزەکانی ئەمریکا لەعیراقدا، ئیدی هێزی داگیرکەربێت یان رزگارکەر، ئەوە جیاوازییەکی سیاسیی گەورەیان لەنێواندا نییە کە پێویست بکا داوای چۆڵکردنی سەربازییانەی ئەمریکا بکرێت لەعیراق و لەسایەی بوونی عیراقدا لەناوچەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست و، لەچەقی دارستانێکی سیاسیدا کە چەندین وەحشیی سیاسیی پشت شکێنەری تیایە، وەحشیگەلێك کە سەرەڕای بوونی هێزەکانی ئەمریکا لەناوچەکەدا، هەوڵ دەدەن هەموو رۆژێك بەشێك لە کێکی عیراق هەڵبلوشن، جا چ جای ئەگەربێت و ئەم هێزانە پاشەکشە بکەن و عیراق بە رووت و قووتی و ئامادەکراوی بۆ ئەو دێو ودرنجە سیاسی و ئەو وەحشییە پشت شکێنەرانە بەجێ بهێڵن کەماوەیەکی دوورودرێژە چاوەڕوانی ئەو هەلەن.

بوونی هێزی سەربازی لەهەریەك لە ژاپۆن ( ٤٧ هەزار سەرباز) و کۆریای باشوور ( ٣٧ هەزار سەرباز ) و ئەڵمانیا ( ٢ ملیۆن سەرباز بەرلە ١٩٨٩ و ملیۆن و نیوێك دوای ئەو ساڵە) بە هێزی رزگارکەر دەستی پێکرد و، پاشان وەرگۆڕا بۆ پاراستنی سەربازییانەی ئەو وڵاتانە لەدەستدرێژی دراوسێکانیان بۆ سەریان. لەڕووەوە، بوونی هێزی سەربازی لەژاپۆندا لە ساڵی ١٩٤٥ەوە تا ئێستا، لەپێشووتردا بۆ پاراستنی ژاپۆن بوو لەشیوعییەتی سەربازیی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا کەئێستا خۆی لەهەڕەشەی ئەتۆمیی کۆریای باکوردا دەبینێتەوە، مەسەلەکە بۆ کوریای باشوور-یش هەروایە. هەرچی ئەڵمانیایە، ئەوە هێزی سەربازیی تێدا

لەئەنجامی ئەو هەڕەشەیە مایەوە کە بەرلەوەی دیواری بەرلین بڕوخێ و بەرلە یەکگرتنی ئەڵمانیا لەساڵی ١٩٩٠، لەلایەن ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتەوە درێژەبووەوە بۆ سەر ئەڵمانیای ڕۆژئاوا.

حاڵی ئێستای عیراقیش، بە پلەی یەکەم، لە حاڵی ژاپۆن و کۆریای باشوور دەچێ. پەند-یش لەپێویستیی بوونی هێزی سەربازیی ئەمریکی لەئەنجامی لەدەستدەرچوونی باری ئارامی نییە لەناو عیراقدا، بەڵکو لەئەنجامی لەدەستدەرچوونی باری ئارامییە لەدەرەوەی عیراقدا و، لەئەنجامی ئەوەیە کە عیراق، لەڕووی جوگرافییەوە، کەوتۆتە ناو دارستانێکی سیاسیی پڕاوپڕ لەو وەحشییانەی کە چاویان خستۆتە سەری. ئەمەش ئەو شتەیە کە قەتەر درکی پێکردبوو کاتێک کەدەرگاکانی خۆی کردەوە بۆ دامەزراندنی گەورەترین پێگەی سەربازیی ئەمریکی لەدەرەوەی ئەمریکا. هەڵبەتە قەتەر ئەم پاسەوانییە سەربازییەی ئەمریکای لەئەنجامی لەدەستدەرچوونی باری ئارامیی ناوخۆیی قەتەر پێویست نییە، بەڵکو لەئەنجامی هەستکردنێتی لەرابردوو و ئێستاشدا بەوەی کە لەلایەن دێو و درنجگەلێکی سیاسییەوە لەناوچەکە کراوەتە ئامانج، سەرووەختی سەدام حسێن-یش سەرووەختی یەکەمی ئەم دێو و درنجە بوو، دیارە هێشتا دێو و درنجی تریش لەناوچەکەدا هەن کە قەتەر لێیان دەترسێت، هەر لەبەر ئەوەش قەتەر سوورە لەسەر ئەوەی کە هێزە لێدەرەکانی ئەمریکا لەوڵاتەکەیدا بمێنێتەوە، ئەمە ئێستا تەواو هەڵوێستی عیراقیشە. نەبوونی سەقامگیریی سیاسیشە لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بەگشتی کەبوونی ئەم ژمارە زۆرەی هێزەکانی ئەمریکا لەناوچەکە پاساودەدات نەك پاساوەکە لەدەستدەرچوونی باری ئارامیی ناوخۆیی بێت. تەنانەت ئەگەر عیراق لەپاشەڕۆژیشدا لەسەر ئاستی ناوخۆ سەقامگیربێت ئەوە بوونی

هێزەکانی ئەمریکا لەعیراقدا هەروەك پێویستیەکی ستراتیژی دەمێنێتەوە، ئەمەش لەئەنجامی بوونی دوو رژێمی دراوسێی عیراق کەئەوانیش رژێمی ئاخوندیی ئێران و رژێمی بەعسی سوریان. ئەم دوو رژێمە گەورەترین هەڕەشەن بۆ سەر سەقامگیریی ناوخۆیی و دەرەکیی عیراق. ستەمی کەسە نزیکەکانیش ئێستا وای لێهاتووە زۆر لەستەمی کەسە دوورەکان مەترسیدارترە.

## — ٤ —

بانگەوازکردن بۆ پاشەکشەکردنی سەربازیی ئەمریکا لەعیراقدا هەقێکە بۆ مەبەستێکی ناهەق باسی دەکرێ.

ئەوانەی چاویان خستۆتەسەر عیراق، ئەوانەی رقیان لەعیراقە و، ئازادی و دیموکراسیی لەعیراقدا رەت دەکەنەوە" لەبابەت پیاوە ئاینیەکان و بەعسییەکان و نەتەوەپەرستەکان و ناسرییەکان و خەڵکی دی، ئائەمانەن کە بانگەواز بۆ پاشەکشەکردنی هێزەکانی ئەمریکا دەکەن لەعیراق بەرلەوەی داوای پاشەکشەی ئەم هێزانە بکەن لەزۆر بەشی تری جیهانی عەرەبیدا. هەموو ئەوانە دەیانەوێ هەر خۆیان بن لەعیراق، دەشیانەوێ شێوازەکانی حوکمڕانی ستەمکارانەی پێشوو بگێڕنەوە جا ئەگەر بەدەموچاوی تازەشەوە بێت، ئەوەی کە ئێستاش رووبەڕووی هەموویان دەوەستێتەوە و لەناوخۆ و دەرەوەدا بەرپەرچیان دەداتەوە ئەو هێزە ئەمریکییانەیە کە خاوەن دارێکی ئاڵۆزن.

## — ٥ —

بوونی هێزەکانی ئەمریکا لەعیراق و لە قەتەر و لەعومان و لە بەحرێن و لە کوەیت و لەناوچەکانی تری جیهانی عەرەبیدا، هەروەها لەژاپۆن و کوریای باشوور و ئەڵمانیا و شوێنی تری جیاجیا لەئەورووپا و ڕۆژهەلاتی ئاسیا و ئەفریقا، ئاستەنگیی بۆ پەرەپێدان و پەرەسەندن و پێشکەوتنی ئەم وڵاتانە دروست نەکردووە، بەڵکو ڕەنگە یارمەتیشی دابن لەوەی کەخەرجی قورس وگرانی بەرگریی لەسەر هەڵگرتوون تائەو رادەیەی کەهەندێ وڵاتی گەیاندۆتە هەڵوەشاندنەوەی تەواوەتی سوپاکەی وەك ئەوەی کە کۆستاریکا لەئەمریکای باشوور کردی، یان هێشتنەوەی ژمارەیەکی رەمزی لەسوپا وەك ئەوەی کە قەتەر کردی ( ٧٥٠٠ سەربان) هەروەها بەحرێن ( ٨٠٠٠ سەربان) و وڵاتانی دیکەی ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاوایی و ئیکتیفاکردن بەوەی سوپای ئەمریکا لەشەڕانگێزیی دراوسێکانیان و دوژمنکارییەکانیان، بیانپارێزێت.

بەلام ئەوەتا ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی من لەوانەی کەدوژمنی عیراقن ئەم پاسەوانییەیان بۆ عیراق ناوێ، دەیانەوێ عیراقی سبەینێ گۆشتێکی سووری داماڵراوبێت لەئێسك بۆ ئەوەی زۆر بەئاسانی بیکەن بەشیشەوە و بیبرژێنن هەروەك ئەوەی کە لەم ڕۆژگارەدا دەیکەن.

## — ٦ —

عیراق بۆتە ئامانجی یەکەمی تاریکخوازانی عەرەبی لەوانەی کە بوونەتە دوژمنی مۆدێرنە و هاوچەرخبوون و دیموکراسی. پێشتر و تائێستاش ئەوە لوبنان بوو کە ببووە ئامانجی تاریکخوازانی عەرەبی، بەلام چیدی لوبنان

ئامانجی یەکەم نییە دوای ئەوەی کەعیراق لەدیموکراسییەتە تازەکەیدا کە لەماوەی چوارساڵدا بەدیی هێنا، کەوتە پێش لوبنانەوە، ئەمە لەکاتێکدا لوبنان لەو دەمەوەی کە لەساڵی ١٩٤٣دا سەربەخۆیی بەدەستهێنا ساڵانێکی دوورودرێژی ویست تاوەکو ئەوە بەدی بهێنێت کە عیراق بەو ماوە کەمە بەدیی هێنا، هەر ئەوەشە کە ئێستا وای لەعیراق کردووە جێی ئیرەیی و رقی تاریکخوازانی خەڵکی نەتەوەکەی من بێت.

کەواتە، ئایا بۆچی بوونی هێزەکانی ئەمریکا لە عیراقدا دەبێتە میوەیەکی حەرامکراو بۆ عیراق لەکاتێکدا بوونی ئەم هێزانە بۆ ئەوانی تر، بۆ عەرەب و عەجەم، میوەیەکە لەمیوەکانی بەهەشت؟

# لیبراڵە ڕەشبینەکان ..

— ١ —

حاڵەتی عیراق، لە بەرەبەیانی ٩ ی نیسان-ی ٢٠٠٣ەوە تاکو ئێستا، بۆ عەرەب ـ ی ئەم چەرخ و سەردەمە، ئەو عەرەبانەی کە پێشتر دۆخە خراپەکان و نەگبەتییەکانی گەلانیان نەدیوە بەتایبەتی دۆخی خراپ و نەگبەتییەکانی رابردووی گەلی عەرەب، حاڵەتێکی کەم وێنە و کارەساتبار و ترسێنەرە. ئەو خەڵکانە لە مێژوودا لایەنێکیان لەو دۆخە خراپانە لە هەردوو سەردەمی ئەمەوی و عەباسی و ئەوەی کە بەدوای ئەو دوو سەردەمەش دێت، خوێندووەتەوە، بەڵام بە چاوی خۆیان ئەو دۆخە خراپانەیان نەبینیوە کە ئەمڕۆ دەیبینن بە تایبەتیش لە عیراقدا.

— ٢ —

عەرەب و لە ناوياندا هەندێ لە ليبراڵە رەشبينەكان وايان دانا كە ئازادی سەيرانێكی جوان و گەشتێكی گەشتوگوزارييانەيە كە بەديهێنانی و پێگەيشتنی لەلايەن عيراق و گەلی عيراقەوە ئاسانە، ئەو عيراقەی كە دوانزە سەدە و زياتريشە واتە لەسەرەتای دەست پێكردنی سەردەمی ئەمەوييەوە تا تەنانەت پێش ٩ نيسانی ٢٠٠٣يش تامی ئازاديی نەكردووە و، چەندين دەهە-ش لە ژێر حوكمی ستەمكاری و زۆرداريی جۆراوجۆردا بووە تا وای لێهات ستەمكاری بووبە مۆركی ئەم گەلە و ناهەقی بووبە خۆراكی و زۆرداری بوو بە سەركەوتنی و خوێنڕشتنيش بووبە خواردنەوەی. ئەمەش خەسڵەتێك نييە لە گەلی عيراقدا كورت بووبێتەوە ئەوەندەی خەسڵەتێكە دەشێت هەر گەلێكی تريش وەری بگرێت" هەر گەلێك كە وەك عيراق ١٢٥٠ ساڵ، لە سەردەمەوە بۆ سەردەمێكی تر و لە سەروەختێكەوە بۆ سەروەختێكی تر، لە ژێر چەكوشەكانی زۆرداری و شمشێرەكانی ستەمكاريدا بێت.

— ٣ —

عەرەب و لە ناوياندا هەندێك لە ليبراڵە رەشبينەكان وايان دانا كە لابردنی رژێمێكی زۆردار-ی وەك رژێمی سەدام حسێن، سەيرانێكی دەريايی يان دەشتاييە و ئەمريكا لە عيراق و لە كەنارەكانی ديجلە و فوراتدا ئەنجاميداوە، بەجۆرێك كە هەركە عيراقييەكان شەو خەوتن و بەرەبەيان خەبەريان بووەوە دەبينن كە عيراق بە پلەی ١٨٠ گۆڕاوە و، لە تاريكاييەكانەوە بەرەو رووناكی و لە سەردەمی خولەفا بەسەرچووەكانەوە

بـۆ سـەردەمی سـەرۆکە فەرمانبـەرەکان هاتۆتـە دەر. ئـەوان ئـەوەیان لـەبیرکردووە کـە ئـەمریکا لـە ئەمەوییـەکان و عەباسـییەکان و مـەغۆل و عوسمانییەکان و هاشمییەکان و بەعسییەکانەوە میراتییەکی ئەوتۆ قورسی بۆ بە جێ هێلراوە کە بە ئەندازەی شاخەکانی هەمەلایا قورسە. ئەمە جگە لـەوەی ئـەمریکا خـۆی لـە قـەبارەی ئـەم میراتـە بـەجێماوە غافڵـە و بەمێژووەکەشـی نـازانێ و فێـڵ لێکـراوە بـە نوخبـەکانی و فریـودراوە بـە پارتەکانی و توشکراوە بەچاڵ و گۆماوەکانی.

— ٤ —

عەرەب و لە ناویاندا هەندێك لە لیبراڵە رەشبینەکان وایان دانا کە ئەوەی لە بەرەبـەیانی ٩ ی نیـسانی ٢٠٠٣ لـە عیراقـدا روویـدا فیلمێکـی سەرکێشیی ئەمریکیی کات بەسەربەرە، فیلمێك لە فیلمـەکانی هۆلیـۆد کە تەماشاکردنی خۆشـە و رەنگـەکانی جوانـە و دەرهێنـانی باشـی بـۆ کـراوە و نوانـدنێکی جوانی تیایە. واشیان دانا کە شەڕگاری خۆیـان بـە دیـار سـەیرکردنی ئەم فیلمـەوە بەسـەربردووە و بەدەمیـشیەوە کاکڵـە و ناوکـەیان تروکانـدووە و فـستق و ( بۆبکـۆرن)یـان خـواردووە و کۆکاکۆلایـان خواردۆتـەوە، ئـەوان مەزەنـەی ئـەوەیان نـەکرد کـە ئـەوەی لـە عیراقـدا روویـدا وەرچـەرخانێکی مێژوویی گەورە و کەم وێنەیە لە مێژووی کۆن و نوێی عەرەبدا و، لـە هـەموو ناوچەی خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا و لە عیراقـدا ئاسـەواری دوورمـەودای خـۆی دەبێت و، یان تەنها لە دراوسێکانی عیراقدا کورت نابێتەوە. هەڵبـەت هەنـدێ لە رژێمە عەرەبییەکانیش کە بە شـەڕێکی، لەیـەك کاتدا، پیس و کوێرانـەوە چوونەتە شەڕی سیستمی نوێی عیراقـەوە، سـەرنجی ئەمـەیان داوە، چـونکە

ئەوەی لە عیراقدا روویدا قەدەرێکە لە قەدەرەکانی مێژوو و، بەریش بە قەدەری مێژوو ناگیرێ.

— ٥ —

عەرەب و لە ناویاندا هەندێك لە لیبراڵە رەشبینەکان وایان دانا قوربانیی ئازادی و دیموکراسی شتێکی کەمە، بە وردی حسابیان بۆ ئەو تێچووەی ئازادی و دیموکراسی نەکرد. لەمەشدا هەقیانە و تەواو هەقیانە، چونکە ئەمە یەکەم جارە لە هەموو مێژووی عەرەبدا کارێکی نەشتەرگەریی سیاسیی ئاڵۆز و سەخت بۆ گەلێکی عەرەب بەڕێوەدەچێت. عەرەب لەم جۆرە نەشتەرگەرییانە ئاگادارنەکراوەتەوە و تاقیشی نەکردۆتەوە و حسابی تێچووە مرۆییەکەی و هەروەها تێچووە دارایی و سەربازییەکەشی نەکردووە. بۆیە هەموو رۆژێ کە تێچووی ئەم پرۆسە کەم وێنەیە دەبینن کە بەدوای یەکدا قوربانی و پارە و چەکی تێدەچێ، ئازارنەچێژن و هەڵدەلەرزن و هەڵدەچن و، بە بۆنەی ترس و تۆقینی زۆریشیانەوە ئومێدی ئەوە دەکەن و دەڵێن ئەگەر رژێمی ستەمکار تا ئێستا بمابایە، ئەوە، وەك عەبدولڕەحمان ئەلڕاشد، کە یەکێکە لە رۆژنامەنوسە لیبراڵە رەشبینەکان و بەڕێوەبەری گشتیی کەناڵی ( العربیة )، بۆ ئەنتۆنی شەدید –ی پەیامنێری واشنتۆن پۆست وتبووی: دۆخەکە باشتر دەبوو لەوەی کە دەیبینن و باسی دەکەن. ئەو لیبراڵە رەشبینانە تێچووی ئازادی و دیموکراسییان لە وڵاتە جیاجیاکانی رۆژئاوادا ئامارنەکرد و بەو باجەیان بەراورد نەکرد کە گەلی عیراق وەك نرخێك بۆ ئازادی و دیموکراسییان داوە. گەلی عیراق گەلێکی خۆشبەختیشە دەوڵەتێکی وەکو ئەمریکای دۆزییەوە کە زۆرێك لە خەرجی

حساباتی تێچووی ئازادی ودیموکراسییەکەی بۆ بدات. ئەگەر ئەمریکا، یان پارە و سوپا و هێزی سیاسیی ئەمریکاش نەبوایە ئەوە گەلی عیراق خۆی بە تەنها نەیدەتوانی ئەوە بەدی بهێنێت کە بەدیی هێناوە ئەمە سەرەڕای هەموو ئەوەی کە لە عیراقدا لە رووداوی رۆژانە و خەرج و قوربانیی زۆر و زەوەند، روودەدات، ئەو رووداوانەی کە ئێمەی عەرەب لەسەری رانەهاتووین چونکە هەروەك وتم پێشتر نەچووینەتە ئەزموونێکی کەم وێنەی وەك ئەم ئەزموونەوە.

— ٦ —

عەرەب و لە ناویاندا هەندێك لە لیبراڵە رەشبینەکان وایان دانا ئەوەی ئێستا لە عیراقدا روودەدات چیرۆکێکی سەرکەوتنە بۆ رێکخراوی قاعیدە و چیرۆکێکی سەرکەوتنە بۆ ئەو رژێمە ئۆتۆکراتییە عەرەبانەش کە دیموکراسییان وا لێکردووە لەدیدی گەلانیاندا وا دەربکەوێت کە شتێکی قێزەوەنە. بواری ئەوەشیان بۆ هەڵکەوتووە کە بە گەلانیان بڵێن: سەیر بکەن ئەوەتا ئەو دیموکراسییەی کە ئەمریکییەکان دەیانەوێ بۆتانی بهێنن، دیموکراسی جگە لە سەرئێشەو ماندوێتی هیچی دی ناهێنێت... ئەوەی کە ئەمریکییەکانیش بەڵێنی پێ دابوون لەبیری خۆتانی بەرنەوە.. هەروەك ئەم قسەیە سەلامە نعمات . ی رۆژنامەنووسی لیبراڵی ئوردنی و بەڕێوەبەری نوسینگەی واشنتۆنی رۆژنامەی ( الحیاة ) بۆ ئەنتۆنی شەدید . ی پەیامنێری واشنتۆن پۆست، وتبووی. ئەمە لە کاتێکدا نەعمات – ی هاوڕێمان دەزانێت ـ بەڵام تاڵی دۆخەکە بیری بردۆتەوە – کە دیموکراسی و ئازادی لە دژی سەرلەنوێ گەڕانەوەی زۆرداری و ستەمکاری وەکو دەرمان

وان. وەك هەر دەرمانێكی تریش دەركەوتەی لابەلایان هەیە كە رەنگە هەندێ جار ببێتە مایەی مردن . هیچ دەرمانێكیش نییە كە دەركەوتی لابەلای خراپی نەبێت، حاڵی ئازادی و دیموكراسییش هەروایە، هەر ئەمەشە كە لە عیراق روودەدات. دەركەوتەكانی ئەو دەرمانەش ئەوەیە كە لە ساڵانی رابردوودا و هەروەها لەمساڵدا بینیمان، بەڵام ئەمە بەردەوام نابێت، چونكە لە كۆتایی قۆناغی هەر چارەسەرێكدا لایەنە باشەكانی دەرمانەكە دەمێنێت و خراپییەكانی دەسڕێتەوە.

— ٧ —

هەندێك لە رۆشنبیرە لیبراڵە رەشبینەكان، ئەوەی لە عیراقدا رۆژانە روودەدات زنۆقی بردوون. ئەو رووداوانەمان مەبەستە كە ئاماژەیەكی روون لەسەر گەورەیی و قوڵیی ئەو گۆڕانە دەدەن كە روویداوە و مەودای ئەو هەنگاوەش كە عیراق لە ٩ نیسانی ٢٠٠٢ەوە بڕیوێتی. لە ناو ئەو رۆشنبیرانەدا هەیە كە دەستی خۆیان لە حاڵەتی عیراق تەكاند و وازیان لێ هێنا، لێشیان هەیە لە پشتگیریكردنی ئەو پرۆسەی ئازادییەی روویدا پەشیمان بووەوە، لێشیان هەیە ئەمڕۆ و سبەینێی عیراق بە رەوشێكی رەشی قەترانی ناودەبا و دەڵێ: هەموو شتێك، هەموو شتێك وەكو رەشی قەترانی دەرئەكەوێت هەروەك مەجدی خەلیل-ی نوسەری لیبرالیستی هاوڕێمان بۆ هەمان پەیامنێری واشنتۆن پۆست-ی وتبوو. هەندێ لە برا لیبرالیستەكانمان وایان مەزەنە دەكرد كە ئەوەی لە عیراقدا روویداوە وەك هەر گۆڕانێك كە لە جیهانی عەرەبیدا روودەدات گۆڕانی رژێمێكی سیاسییە. دیارە لە سوریا چەندین جار رژێم گۆڕا، لە میسر، لە یەمەن، لە لیبیا، لە

سودان، له جەزائیر و له وڵاتانی تری عەرەبیشدا گۆڕا، بەڵام ئەوەی کە له عێراقدا روویدا لەو وڵاتانەدا روونەدا. چونکە ئەو گۆڕانەی کە له ڕژێمی ئەو وڵاتانەدا روویدا سەیرانێکی سیاسی بوو. هەندێ له برا لیبرالیستەکان تێچوویەکی خاکییانەشیان بۆ ئازادی و دیموکراسی دەویست، ئەو تێچووە هەرزان بەهایەی کە گەلانی تری عەرەب وەك نرخێك بۆ ئەو گۆڕانە سیاسییەیان دا کە روویدا. ئەو رۆشنبیرە لیبرالیستانە عەقڵییان بەوەشدا نەشکا کە ئەو تێچوورانە بۆ ئەو کودەتا و ڕژێمانەی کە گۆڕدران وەك نرخێك بۆ ئازادیی راستەقینە و دیموکراسیی رەوا نەدراوە ئەوەندەی وەك نرخێك لە پێناوی کوتەکێك لە بری کوتەکێکی دی و، زیندانێك لە جیاتی زیندانێکی تر دراوە بە بادا. ئەوە جەلاد و زۆردار و ستەمکار-یش بووە کە گۆڕدراوە نەك سیستمی حوکمڕانی. بگرە رەنگە ڕژێمە کۆنەکان له هەندێ وڵاتی عەرەبیدا باشتربوبێتن لەو ڕژێمانەی کە کودەتایان بەسەردا کرا و لاقی رزگاریخوازی و پێشەنگایەتی و مۆدێرنێتی و .. هتد یان.. دەدا..

— ٨ —

ئەنتۆنی شەدید ـ ی پەیامنێری واشنتۆن پۆست له چاوپێکەوتنەکەیدا لەگەڵ ژمارەیەك له سمبولە عەرەبیە لیبراڵییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەمریکا گەشتە ئەنجامێك ئەویش ئەوەیە زۆربەی ئەوانەی پشتگیریی روخاندنی ڕژێمی سەدام حسێن-یان دەکرد ئەوەیان رەتکردەوە کە وەڵامی پرسیاری ئەوە بدەنەوە ئاخۆ هێشتا پشتگیریی داگیرکردنی عیراق لەلایەن ئەمریکاوە دەکەن یا نا.. هەندێکیان وتیان : خودی پرسیارەکە مەحاڵەو نادادپەروەرانەیە. ئەوەی تێبینیش کراوە ئەوەیە رۆژنامەی واشنتۆن پۆست

کــە لــە رۆژنامــە بەرهەڵــستکارەکانی رژێمــی ســەرۆك بــۆش  ە و،
ەرهەڵستکارێکی تونـدی هەڵمەتکردنیـشە بـۆ سـەر عـێراق و رزگـارکردنی
عێراق بەو شێوەیەی بەڕێوەچوو، بە ئەنقەست وەڵامە ئەرێکانی(الإیجابیة)
لابرد و وەڵامە نەرێکانی لەسەر حاڵەتی عێراق پاراست و بڵاوکردەوە. من
خۆیشم یەکێك بووم لەو کەسانەی کە لەسەر رەوشی عێراق لەلایەن ئەو
ڕۆژنامەیـەوە پرسـیارم لێکـرا، بـەڵام ئـەم رۆژنامەیـە وەڵامــە ئەرێیانــە و
گەشبینانەکەی من و زۆرێکی ترمانی لابرد.

وەڵامەکەیشم روون بوو، ئەویش ئەوەیە" ئەوەی لە میانەی چوارساڵی
ڕابـردوودا روویـدا دەبوایـە رووی بدایـە و لـە حیساباتیـشدا هـەبوو، بگـرە
ئەوەی روویدا زۆر کەمترە لەوەی کە پێشبینیم کرد. هـەتا ئێستاش عێراق
لەبـەردەم رێگایـەکی دوورودرێـژە بـۆ ئـەوەی بگاتـە سـەقامگیری. دەبـێ
ئەوەشمان بیربکەوێتەوە کە عێراق بە سنوری هۆڵەندا و بەلجیکا و فەرەنسا
و سـوید و ئـەڵمانیا و وڵاتـانی دیکـەی عـەلمانی و پێـشکەوتوو و ئـازاد و
دیمـوکرات، دەورە نـەدراوە. عـێراق کەوتۆتـە ناوەنـدی دارسـتانێکەوە لـە
دیکتاتۆرییە حزبی و خێزانی و ئاینی و کۆمەڵایەتییەکانیش. عێراق رەنگە
دەیـان سـاڵی بوێـت تـا حـاڵ و بـارودۆخی سـەقامگیربێتەوە، بـەڵام عـێراق
هــەروەك وڵاتێکــی خۆشــبەخت و پــیرۆز دەمێنێتــەوە کــە مێــژوو دێــت و
دەوڵەتێکی وەك ئەمریکای بۆ دەنێرێ، ئەمریکایەك کـە هـاتووە دوژمنـەکانی
عـێراق دەپـشکنێ بـۆ ئـەوەی لـەناویان بـدات، ئـەو ئەمریکایـەی کـە خـۆی
لەبەردەم میللەتێکی کوێلەکراوەدا بینیوەو بە نرخێکـی زۆر و گـران ئـازادی
کرد. من بە قوڵی و قەناعـەتێکی تـەواوەوە باوەڕ و قەناعـەتم بـەوە هەیـە کە
عـێراق، دووربێـت یـان نزیـك، نموونـە چـاولێکراوەکە دەبێـت بـۆ عـەرەب بـۆ
ڕۆژهەڵات ناوەڕاستییەکان بەگشتی. لە دواڕۆژیشدا گەلانی تری چەوساوەو

کۆیلەکراو بە دوای هەلێکدا دەگەڕێن وەك هەلی عیراقی – ئەمریکی بۆ ئەوەی خۆیان لەو دۆخەی تیایدان رزگاریکەن، بەڵام ئەو هەلە نابیننەوە. چونکە کۆششی ئەمریکا و، پارەی ئەمریکا و سووربوونی ئەمریکا و بانگەوازی مێژوو لە هەموو کات و شوێنێکدا فەراهەم نابێت.

# دانبەخۆدابگرن،
# جەنگ هێشتا کۆتایی نەهاتووە..

ـ ١ ـ

هێشتا راپۆرتەکەی بیکەر – هاملتۆن لە جیهانی عەرەبیدا بڵاونەکرابووەوە کە شەقامی عەرەبی سەرکەوتنی دیاری خۆی بەسەر ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە ناوچەکە راگەیاند، ئەو شەقامەی کە پارتە ئاینییە توندڕەوەکان و پاشماوەی ئەو پارتە نەتەوەپەرستانە بەسەریدا زاڵە کە لە دوا هەناسەدانی خۆیانــدان. خۆشـیی ئـەم سـەکەوتنە و شـیرینییەکەی هێندەی تریش زیادی کرد کاتێك کە جۆرج بۆش رایگەیاند : ئەمریکا تا ئێستا لەم شەڕەدا قازانجی نەکردووە. ئەو نەیوت شکستمان هێنا لە جەنگێکدا کە کۆتایی هات و سبەینێ لە عیراق پاشەکشێ دەکەین. جیاوازییەکی گەورەش لە نێوان ئەوەدا هەیە کە بڵێی: ئێمە هێشتا لە شەڕێکدا سەرکەوتوو نەبووینە و، نێوان ئەوەی بڵێی: ئێمە شکستمان هێنا

و جەنگ كۆتایی هات و سبەی دەكشێینەوە. ئەمەش جێی سەرسوڕمان نییە، ئەمە هەمیشە رەفتاری عەرەبە لە شیكردنەوەی دەرئەنجامەكانی جەنگە سەربازییەكانیان و شەڕە قسەكانیان و جەنگە عەنتەرییەكانیان لەگەڵ ئەوانیتر و هەڵێنجانی دەرئەنجامەكانیان. لەم رووەوە، بە درێژایی مێژووی نوێی عەرەب، تا ئێستا عەرەب دانیان بە هیچ شكستخواردنێكی خۆیاندا نەناوە لەهەر شەڕێكدا كە كردوویانە جا لەگەڵ ئیسرائیلدا بێ، یان لەگەڵ رۆژئاوا، یان لەگەڵ ئەمریكا، یان لەگەڵ دەرودراوسێ، یان هەر لایەنێكی تر لە لایەنەكان. لەم رووەوە شكستخواردنەكانی عەرەب، كە وەك روونی-ی رۆژ روونن، بەلای عەرەبەوە، نەسكۆن نەك شكست هێنان، جەنگە دۆڕاوەكانیشیان لەگەڵ دوژمنانیدا نەگبەتی ـــ ن نەك شكستهێنان. سەرزەمینە داگیركراوەكانیشیان لەلایەن داگیركەرە ئیسرائیلییەكان و توركەكان و ئێرانییەكان و ئیسپانییەكان بوونەتە شتە لەیادكراوەكان و، كەسێك نییە نە دۆز و مەسەلەكانیان بورووژێنێ و نە داوایان بكا و ڕەنگە نە بیریشیانی بكەوێتەوە. ئێستا كێ لیوای ئەسكەندەرۆنە و، سەبتە و مەلیلە و، هەر سێ دوورگەكەی ئیمارات ( مەبەستی لە تونبی گەورە و تونبی بچووك و ئەبو موسایە / وەرگێڕ) و، فەلەستینی پێش ١٩٤٨ و پێش ١٩٦٧ی لە بیرە ؟

— ٢ —

چەند رۆژێكە، عەرەب، بە سەركەوتنە خەیاڵییە لافدراوەكەیان بەسەر ئەمریكادا لە عیراق، دڵخۆشن – ئێمە خۆزگەشمان دەخواست ئەو سەركەوتنە راست و واقعی بوایە – پاشان نازانم ئەوان بەسەر كێدا سەركەوتوون و چۆن سەركەوتوون و چییان لەم سەركەوتنە بەدی هێناوە؟

ئایا سەرکەوتنیان لە عیراق لە ئەنجامی ئەوە هاتووە کە توانیویانە هەموو ڕۆژێك سەد هاووڵاتیی عیراقی لە بازاڕەکان و مزگەوتەکان و زانکۆکاندا بکوژن؟ ئایا سەرکەوتنیان لەوەوە هاتووە کە جلوبەرگی سوپا و پۆلیسی عیراقیان لەبەر کردووە و خەڵکی ریش سپی و ژنیان لە تاکەکانی میللەتی عیراق رفاندووە؟ ئایا سەرکەوتنیان بەو جلەی لەبەریان کردووە ( جلی سوپا و پۆلیس ) لەوەوە هاتووە پەلاماری بانکەکانیان داوە و پول و پارەی گشتییان دزیوە وەك ئەوەی عیراق بۆ سەدە سەرەتاییەکانی یەکەمین گەڕابێتەوە کە مرۆڤ لە دارستاندا دەژیا و، خەریکی راو و ڕووت بوو لە دەریاکاندا؟ . ئایا سەرکەوتنیان لە ئەنجامی دەست درێژیانەوە هاتووە بۆ سەر پەرەستگا ئیسلامی و مەسیحییەکان، سوننیی و شیعییەکان و، کوشتنی پیاوانی ئاینی و سوجدە بردن و سەردانواندن بۆ خوا ؟

ئایا، هەر بە ڕاستی، سوپای ئەمریکا شکستی خواردووە؟ ئەی ئەو سوپا سیستماتیکییەی بەرامبەری کێیە کە شکستی پێهێناوە؟

سوپای سیستماتیکی ئەمریکا سوپایەکە ئامادەکراوە تاوەکو شەڕی سوپایەکی سیستماتیکیی وەك خۆی بکا نەك ئەو میلیشیاتە دەمامککراوانە بە دەمامکی جلی سوپا و پیاوانی ئاسایشی عیراق. سوپای سیستماتیکی عیراق، هەرکە سوپای ئەمریکا هات بۆ ئەوەی بچێتە زۆرانبازییەوە لەگەڵیدا لە مانگی ئازاری ٢٠٠٣دا، بەرلەوەی سوپای ئەمریکا بگاتە بەغداد داڕوخا و خۆی دا بە دەستەوە. ئیتر کامەیە ئەو سەرکەوتنەی کە قسەی لێ دەکەن ؟

## - ٢ -

ئەمریکا - دوای ئەوەی خەوێکی درێژی لێکرد و غافڵگیر و لووتبەرز کرا - ئێستا وای لێهاتووە چاك دەزانێ کە دوژمنی سەرەکی و راستەقینەی ئازادی و دیموکراسی لە ناوچەکەدا کێیە و، کێش دەیەوێت رۆژهەلاتی ناوەڕاست سەراوژێر هەڵگێڕێتەوە و ببێتە میراتگری جیهانی عەرەبی (پیاوە نەخۆشەکە) و حکومەتگەلێکی ئاینی-ش لەسەر شێوەی حەماس لە غەززە و حزبوڵلا لە باشووری لوبنان دابمەزرێنێ. ئەمریکا ئێستا دەشزانێ کە لەسەریەتی شەڕی کێ بکا بۆ ئەوەی رێگای ئازادی و دیموکراسی لەبەردەم گەلانی ناوچەکەدا بکاتەوە؟

ئەو دەوڵەتەی کە بە درێژایی سالانی رابردوو ئەو پارە زۆر و زەوەندەی داوە . کە ئەوەش هیچ دەوڵەتێکی تری سەر ئەم زەمینە ناتوانێت بیدات ـ و خوێنی رۆڵەکانیشی وەك نرخی کردنەوەی رێگای ئازادی و دیموکراسی پێشکەشکردووە، واز لە تەواوکردنی پەرستنی رێگای بەردەم گەلانی ناوچەکە ناهێنێ بۆ گەیشتن بەو ئازادی و دیموکراسییە کە گەلانی ناوچەکە بە ویستی خۆیان هەڵیاندەبژێرن. لەم رووەوە، لەسەردانەکەی ئەم دواییەیدا بۆ بەغدا وەزیری تازەی بەرگریی ئەمریکا رۆبەرت گیتس، هێرشی کردەسەر سووریا و ئێران و، دڵەڕاوکێی خۆی لە ئاست ئەو ( رۆڵە سلبی)یەش دەربڕی کە ئەو دوو وڵاتە دەیگێڕن بە تایبەتی لە عیراقدا. لە دیدارێکیشدا لەگەڵ سەربازەکانیدا، وتی: (( دەبێ دراوسێکانی عیراق باش لەوە تێبگەن کە ئێمە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە کەنداودا دەمێنینەوە)). داوای لە هەردوو وڵاتیش کرد کە پێویستیی تێگەیشتنی ئەو چوارچێوە هەرێمایەتییە بزانن

کە ململانێی تیادا دەکرێت. هەروەها چەند بەرپرسێکی سەربازیی ئەمریکیش ئەوەیان دووپات کردەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیا دەستدەکەن بە جوڵاندنی کەشتیگەلێکی جەنگیی زیاتر بەرەو کەنداو، بێگومان ئەوەش بۆ پیشاندانی خواستی سەربازییان لە ئاست ئێران و سوریادا. بەرپرسان ئەوەشیان ووت کە رۆبەرت گێتس–ی وەزیری تازەی بەرگری پێشبینیی ئەوە دەکات هەر لەم هەفتەیەشدا موسادەقەی داواکاریی فەرماندە سەربازییەکانی ئەمریکا بکا کە داوای ناردنی فرۆکە هەڵگرێکی تریان کردبوو بۆ کەنداو، ئەمە لە کاتێکدا کە بەریتانیاش لای خۆیەوە دوو راماڵێنەری ( کاسحة ) تری مین –ی دەنێرێت.

**— ٤ —**

ئەگەر عەرەب وای دادەنێن کاتێك کە سوپای ئەمریکا ناتوانێ ئاسایش و سەقامگیری لە عیراقدا بەرپا بکات، سەرکەوتنیان لە عیراقدا هاتۆتە دی، ئەوە خەتاکە هەمووی خەتای سوپای ئەمریکا نییە، بەڵکو بەشی گەورەی بەرپرسیارێتییەکە لە ئەستۆی دەستەبژێری سیاسیی عیراق و گەلی عەرەبی عیراقیشە. سوپای ئەمریکا کە دەچێتە ناو عیراقەوە، هەموو یەك سوپایە، بەیەك ئامانج و یەك نەخشە و یەك چەکەوە دەچێت، سوور و سەوزی نییە، یان هەڵبژاردن و زۆرەملێی نییە. باشە بۆچی لە دوای ٩ ی نیسانی ٢٠٠٣ەوە ئاسایش و سەقامگیری و بونیادنان و پەرەپێدان لە کوردستانی عیراقدا هاتە ئاراوە و لە ناوەراست و لە باشووری عیراقدا نەهاتە گۆرێ تائەو رادەیەی لەگەڵیدا عیراقییەکان بۆ داواکردنی ئاسایش و سەقامگیری و

ئازادی لە باشوور و ناوەڕاستەوە کۆچ بۆ باکوری عیراق بکەن ؟ ئایا عیراق هەر هەمووی ئەو عیراقە نییە کە ئەمریکا بە سوپاکەی داگیری کردووە؟

کەواتە هەموو شوورەییەکە ئەمریکا نییە، بەڵکو شوورەییەکە شوورەییەکی عەرەبی عیراقییە و، کێشەی عەرەبی عیراقە لە ناوەڕاست و باشوور بەر لەوەی سوپای ئەمریکا بچێتە عیراقەوەو دوای ئەوەش کە چووە عیراقەوە.

ئینجا با گریمانەی ئەوە بکەین کە ئێستا ئەوە سوپای ئەمریکا و، بە دوایشیدا ئیمپراتۆرییەتی گەورەی ئەمریکا، لەو شەڕەی پێشوویدا بەشکستێکی گورچکبڕ شکستی هێنا لە ئەنجامی هۆکارگەلێك کە هەمووان دەیزانن، ئایا ئیدی جەنگ لە عیراقدا کۆتایی هاتووە یان شەڕێك لە شەڕەکان کۆتایی هاتووە و شەڕی تریش بەڕێوەیە هەروەك وەزیری بەگری رۆبەرت گێتس دەڵێ ؟

پاشان ئایا عیراقی مەزن بە پاشەڕۆژی و بە ستەمکاریی حوکمڕانەکانیشی لە سەردەمی عەباسی ( ٧٥٠م - ١٢٥٨م) و لە سەردەمی مەغۆلی ( ١٢٥٨م- ١٥٣٤م) و لە سەردەمی عوسمانی ( ١٥٣٤م- ١٩١٧م) و لە زەمەنی کۆلۆنیالیزمی ئینگلیز ( ١٩١٧م- ١٩٢١م) و ئینجا لە سەروەختی پاشایەتی ( ١٩٢١م- ١٩٥٦م) و لە سەروەختی کۆماری (١٩٥٨م- ٢٠٠٣م) ەوە، بەو خێراییە توانای چارەسەربوون و گەڕانەوەی هێز و ئازادی و بە دەستهێنانەوەی عافێتی خۆی هەیە دوای ئەو سەردەمە دورودرێژە لە ستەم و ستەمکاری و داپڵۆسین و سەرکوتکردن و دواکەوتن و کوشتنی بە کۆمەڵ ؟

ئێمە بە ئەنقەست مێژووەکانی داپڵۆسینمان لە عیراقدا بە ووردی خستەڕوو بۆ ئەوەی ئەوە بیربخەینەوە کە عیراق لە باکور و باشوور و

ناوەڕاستدا، ماوەی ١٢٥٣ ساڵە، واتە ١٢ سەدە و نیوە لە ژێر ستەم و سەرکوتکردن و داپڵۆسین و ستەمکاری و دواکەوتن وکوشتنی بەکۆمەڵدا بووە.

کەواتە، ئەمریکا هاتە عیراق بۆ ئەوەی ستەم و سەرکوتکردن و داپڵۆسین و ستەمکاری و دواکەوتنێك بسڕێتەوە کە ١٢٥٣ ساڵ بەردەوام بووە، واتە دوانزە سەدە و نیو. ئایا ئەم لەپاش جێمانە مێژووییە قوورسە بە قوورسایی شاخەکانی هەمالایا، لە ماوەی سێ یان چوار ساڵدا، تەواو دەبێت؟

بەڵێ شەڕێك لە شەڕەکان کۆتایی هات، بەڵام جەنگەکە کۆتایی نەهاتووە، جا، هەروەك یەعقوب وتی، ئەو دەمەی کە براکانی یوسف، یوسف ـ ی برایان خستە بیرەکەوە، دانبەخۆدا بگرن. چونکە عیراقی ئەمڕۆ یوسفی دوێنێیە. براکانیشی لە دەر و دراوسێکانی، هەر ئەوانن کە عیراقیان فڕێدایە بیرەکەوە ( بیری تیرۆر). بەڵام ئەوەی کە هەقە سبەی ڕۆژ هەر دەردەکەوێ، بەو نزیکانەش یوسف ـ ی عیراق لە تەڵەی براکانی قوتاری دەبێ و لە بیرەکە دەردەچێ و، عیراقی یوسف ـ یش وەك پەندێك بۆ عاقڵەکان دەمێنێتەوە.

# بۆچی داگیرکردنی کولتورییان بۆ ئێمە، سەرکەوتنی بەدەست هێنا ؟

لەماوەی نیوەی دووەمی سەدەی بیستدا دەرکەوتەکانی داگیرکردنی کولتورییانەی جیهانی عەرەبی لەلایەن رۆژئاواوە و میکانیزمەکانی ئەو داگیرکردنە، خۆیان لە گەندەڵبوونی ئەو بەها فکری و کۆمەڵایەتییانەدا دەبینییەوە کە لەگەڵ کۆلۆنیالیزم و لاوازبوونی هەستی نەتەوەیی و نەمانی هەستی نیشتمانپەروەری لای هەندێ لە ئەدیبان و رۆشنبیران، بڵاوبوونەوە. لەم رووەوە، داگیرکردنی کولتوریی لەرێگەی داگیرکردنی زمانەوە دزەی کرد بۆ ئەدەب و ئاسەوارەکەشی لەسەر خاوەن بەهرە ئەدەبییەکان ترسناك بوو.

فکری عەرەبی مانایەکی بە داگیرکردنی کولتوریی بەخشی کە خۆی لە هەژموونی کولتوریدا دەبینێتەوە" هەژموون بەهۆی راگەیاندن و ئامرازە پێشکەوتووەکانییەوە کە وایان لێ هاتووە سنورەکان و ئاستەنگەکان ناناسن، وەك ئامرازەکانی پەخشی تەلەفزیۆنی لەرێگەی مانگە دەسکردەکانەوە، ئەمە جگە لە نێزگەکان و فیلمە سینەمایی و تەلەفزیۆنییەکان و تۆمارە ڤیدیۆییەکان.

پرسیاریش ئەوەیە کێ هەموو ئەمانەی بۆ کولتوری رۆژئاوا رەخساند؟

ئایا ئەوە نەبوو بە تاکە کەناڵێکەوە – واتە ئەلجەزیرە- کە لە قەتەر دامانمەزراند و کەناڵێکی هەواڵییە و توانی لەماوەیەکی کەمدا ملیۆنەها بینەر لە جیهانی عەرەبی و دەرەوەی جیهانی عەرەبی لە کەناڵی هەواڵیی CNNی ئەمریکی بۆ خۆی بەرێت، توانیمان رووبەڕووی لایەنێکی میدیای رۆژئاوا ببینەوە لەبەر هیچی دی نا تەنها لەبەر ئەوەی ئەم کەناڵە پشکێکی کەمی لە ئازادیی راگەیاندن هەیە کە ئەودوای کەناڵە رەسمییەکانی تەلەفزیۆنە عەرەبییەکان لێ بێ بەشن. ئەمە چ جای ئەوەی لەپەنجاکانەوە ئێمە متمانە بە هەواڵی هیچ ئێزگەیەکی عەرەبی ناکەین جگە لەیەك ئێزگەی بیانی نەبێت کە بەشی عەرەبی BBCی بەریتانییە؟

چۆن بتوانین لە فیلمی ئەمریکیش دوور بکەوینەوە کە گەیشتۆتە لوتکەی پیشەسازیی سینەما لەکاتێکدا سینەمای عەرەبی و بەتایبەتیش سینەمای میسری گەیشۆتە نزمترین پلەکانی دابەزین و سووکبوون و وای لێهاتووە زۆر بەدەگمەن دەبینی فیلمێکی عەرەبی هەبێ شایەنی سەیرکردن بێت؟

کەواتە نەنگییەکە، وەك محەمەد عابد ئەلجابری بەرلە ماوەیەك وتی، لە خۆماندایە، لەلاوازیی کولتورە فشەڵ و داوەشیوەکەماندایە، لەو کولتورە داگیرکەرەدا نییە کە دێت و لەهەمان کاتدا دەشخوازرێت، ئەو کولتورەی کە بووەتە چێشتی پیسکە: دەخورێ و زەمیش دەکرێ.

لەسەریشمانە تێبینیی ئەوە بکەین کە ئەم زەمکردنە هەمیشە لە کەسانێکی دیاریکراوەوە دێت و لە هەموو وەرگرەکان و بەکاربەرە راستەقینەکانی ئەم کولتورەوە نایەت. ئەمەش ئەو شتەیە کە (( تورکی ئەلحەمەد)) گوزارشتی لێکردووە کە دەڵێ: هەڵوێستی کولتور –ی عەرەبی لە

کولتـــوری رۆژئـــاوایی جیهـــانی، هەڵوێـــستێکی ئایدیۆلۆژییـــە و لـــە مامەڵەکردنیـــشیدا لەگـــەڵ کولتـــوری رۆژئـــاوادا لـــە چـــەمکەکانی لەبابـــەت ڕەتکردنەوە و گومانکردنی ڕەها و، داواکردنی سەروەری و پێشەوایەتی بۆ خۆی، واتە بۆ کولتوری عەرەبی، پێوەندانگ دەگرێت.

وەڵامدانەوەی هاووڵاتیی عەرەب بۆ لێدانی ئەو زەنگانەی کە لە هـەموو لایەکەوە یان لە شوێنێکەوە دێن کە دیاردەی کۆلۆنیالیزمی تێدا بێت، بە دەرکـەوتی داگیرکردنـی کولتـوری لەقەڵـەم درا، چـونکە نەخـشەکانی ئـەو دەرکەوتانەی داگیرکردن لەبنەڕەتدا لەسەر خولقاندنی ئامادەباشیی مرۆڤی عـەرەبی دەوەستێ " ئامادەباشـی بـۆ دەرچوونی لە ڕەگ و ریشەی خـۆی و قبوڵکردنی دۆخی تازەی دزراوی خۆی، ئەمـەش دوای قۆنـاغێکی دوورودرێژ لـە مێشك شوشـتنەوەی بـەردەوام بـەپێی کۆمەڵـە بەرنامەیـەك کـە هـەموو دەزگاکانی کۆلۆنیالیزمی کولتوری و سیاسی بەشدارییان تێدا دەکەن.

هەنـدێ لـە بیرمەنـدانی عـەرەب وەك مـەحمود ئـەمین ئـەلعالم سـەرنجمان ڕادەکێشن بـۆ ئـەوەی کـە داگیرکردنـی کولتـوری داگیرکردنێکـی دەرەکییانـە نییـە بـەڵکو داگیرکردنێکـی کولتورییـە کـە لـەناو خۆمانـەوە دێـت. ئـەو بیرمەندانـە، وای لەقەڵـەم دەدەن کـە مەینـەتیی کولتـوری لـە داگیرکردنـی کولتورییـــەوە نـــەهاتووە بەتـــەنها، بـــەڵکو لـــە بونیـــاتی دەرەکییانـــەی کولتورمانـەوە هـاتووە و، چوارچێوە سیاسـی و ئـابوری و دواکـەوتنخوازە ڕابەستە و لەئاراکان، دەیخەنەوە. ئەو بونیاتە کولتورییەش ئەو بونیاتەیە کـە زەمینـە بـۆ پێـشوازیکردن لـە کولتـوری زایـۆنیزم و ئیمپریـالیزم دەرەخسێنن و بگرە زەمینە بۆ چاندنیشیان خۆش دەکەن ( بڕوانە: مساهمة ، التمهيد لوضع مشروع أستراتيجية ثقافية .. ص ١٠ ).

هەندێ لە بیرمەندە لیبراڵییەکانی عەرەب-یش دەڵێن : داگیرکردنی کولتوریی ڕۆژئاوایی خۆی لە ڕۆشنبیریی ڕۆژئاوادا نابینێتەوە کە سیمبولەکانی فەلسەفە و ئەدەب و فکری ڕۆژئاوا دەینوێنن، بەڵکو ئەم داگیرکردنە خۆی لە کۆمەڵگای بەکاربەر و توانەوە و بەڕۆژئاوابوون دەبینێتەوە، ئەمەش دۆزێکی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتییە کە بەرهەمی شارستانییەتی سەروەرییە لە ڕۆژئاوادا. لە ڕێگەی ئەوەشەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کەشی کۆمەڵایەتی و ئابووریی عەرەبی ئەم داگیرکردنەی پێ قبوڵە و پێشوازیی لێ دەکا و دەرکەوتەکانیشی بەکاردەبات، ئەمە لەکاتێکدا هەندێ لە توێژەران وای دادەنێن کە بڵاوبوونەوەی فێرگە و خوێندنگە بیانییەکان بەتایبەتیش لەوڵاتی شام-دا یارمەتی داگیرکردنی کولتورییانەی جیهانی عەرەبییان دا. هەروەها واشی لەقەڵەم دەدەن کە پشتگیریی دەوڵەت بۆ ئەو جۆرە فێرگە و خوێندنگانە و، پشتگوێخستنی خوێندنگا نیشتمانییەکان، کە ناسنامەی نیشتمانییان جێگیر دەکرد، فاکتەرێکی دیکەی توندبوونی داگیرکردنی کولتوری بوو.. ( بڕوانە : عماد حاتم، الغزو الثقافي الممهد و المتوافق مع الإستعمار الحديث في الوطن العربي، ص ٥٩ ).

لەلایەکی تر، زۆرجار داگیرکردنی کولتوری شێوە و دەرکەوتی کۆلۆنیالیزمی نوێ یان گەڕانەوەی کۆلۆنیالیزم وەردەگرێ دوای ئەوەی کە کۆلۆنیالیزم، لەڕووی سەربازییەوە، ڕۆیشت و نەما. هەندێ لە توێژەراز دەڵێن: کاتێک کە داگیرکردنی کولتوری شێوەی کۆلۆنیالیزمی نوێ وەردەگرێت ئەوە بۆ مسۆگەرکردنی کاریگەریی ئایدیۆلۆژیی خۆی، پەنا بۆ ڕێگەوشوێنی جیاجیا دەبات، بۆ ئەوەش کۆمەڵە ڕێکخراوێکی جیاجیە بەکاردەهێنێت کە ڕەنگە سەیرترینیان ئەوە بێ کە بە (( فەیلەقی ئاشتی))؛

ئەمریکی ناوەبریّ کە چالاکیی خۆی ئاراستە دەکات بۆ فۆرمۆلەکردنی وێنەیەکی زۆرباش لەسەر ئەمریکا. هەروەها داگیرکردنی کولتوری لە نوێترین دۆخیدا دەرکەوتی جیاجیا لەخۆ دەگریّ، لەوانە: پێشکەشکردنی یارمەتی و زەمالەکانی بواری کولتوری لەلایەن رۆژئاواوە بۆ خوێندکارانی جیهانی عەرەبی و، هاندانی ئەو خوێندکارانەی عەرەب کە لە رۆژئاوا دەخوێنن لەسەر ئەنجامدانی توێژینەوە لەبارەی جیهانی عەرەبی و لەبەرژەوەندیی رۆژئاوا. هەروەها هەڵسانی رۆژئاوا بە بەرهەم هێنانی ئامرازە رۆشنبیرییە جیاجیاکان لە کتێب و بڵاوکراوەکان و فیلمەکان و، بەستنی موحازەرە و کۆنگرە و کۆڕەکان و شتی تری جیاواز. هەروا ئیغراکردنی عەقڵە عەرەبییەکان لەسەر کۆچکردن بۆ رۆژئاوا و بە هاندانی خودی دەوڵەتانی عەرەبی خۆشیان، ئەمەش بەبۆنەی دەرکردنی بەرهەڵستکارانەوە بۆ دەرەوەی بازنەی سیاسیی عەرەبی.

دوای پەیماننامەی ئاشتیی میسری – ئیسرائیلی-ی ساڵی ١٩٧٩، چەند گروپێك لە زانایان و پزیشکان و پیشەسازانی جولەکە روویان کردە میسر، ئەوەش بەپێی رێککەوتنامەی هاوکاری ساڵی ١٩٨٠ لە بواری پەروەردە و فێرکردن و تەکنەلۆژیا لەنێوان ئیسرائیل و میسردا. ئەو رێککەوتنامەیە بەدەق باس لەئاڵوگۆڕی شارەزاییە زانستی و پزیشکییەکان و دۆزراوە شوێنەوارییەکان و کردنەوەی پێشەنگاکان و ئاڵوگۆڕکردنی بەرنامە میدیاییەکان و شتی دیکە دەکات لە هاوکاریی ئاڵوگۆڕکراو لەبوارەکانی پەروەردە و فێرکردن و زانست و تەکنەلۆژیادا. دەستەی پەرەپێدانی نێودەوڵەتیش بڕی شەست ملیۆن دۆلار-ی دیاری کرد بۆ پێشکەشکردنی بە زانکۆکان و سەنتەرە زانکۆییەکانی توێژینەوە، کەچی هەموو ئەمانە لەلایەن هەندیّ لەرۆشنبیرانی میسری و عەرەبیشەوە بەوە

لەقەڵەم دران کە بەئەندازەی داگیرکردنی کولتوری–ن و، لەلایەن ئەوانەشەوە کە ئاساییکردنەوەی پەیوەندییان لەگەڵ ئیسرائیلدا رەتدەکردەوە هێرش کرایە سەر ئەم پرۆژە رۆشنبیرییە هاوبەشانە.

دەرکەتەکانی داگیرکردنی کولتوری هەر لەوانەی پێشتر باسمان کردن کورت نەبوونەوە، بەڵکو هەندێ لە توێژەران وایان لەقەڵەم دا مۆزیکی میللی رۆژئاوایی لە دیارترین دەرکەوتەکانی داگیرکردنی کولتوری جیهانی عەرەبییە لەلایەن رۆژئاواوە. ئەو مۆزیکەی کە ناخی گەنجی عەرەبی گرتووەو هۆکارێکیش بوو بۆ رقهەڵگرتنی توندی دامەزراوەی ئاینی و هەندێ لەدامەزراوە کۆمەڵایەتییە عەرەبیەکان لە مۆزیکی رۆژئاوا و پاشان لە کولتوری رۆژئاوایی - ش.

ئەگەر بە ووردیش سەیر بکەین دەبینین هۆی هەموو ئەوانە لە زاڵبوونی مۆزیکی رۆژئاواییدا نییە، بەڵکو لە کەمتەرخەمیی خۆمانە لەئاست مۆزیکی عەرەبیماندا، ئەمەش یەکێك لە دیارترین دەرکەوتەکانی داگیرکردنی کولتووری دەخاتە ژێر پرسیاری سەرلێدەرنەکراوەوە. یەکێك لە توێژەران و لێکۆڵەرانی بواری مۆزیك توانی پەنجەمان بخاتە سەر برینەکەمان و پێمان بڵێ کە چۆن کەمتەرخەمیی خۆمان لەبواری مۆزیکدا دەرگاکانی لە جیهانی عەرەبیدا لەبەردەم مۆزیکی رۆژئاواییدا کردەوە، ئەمە لەدەمێکدا ئەوەی کە بە داگیرکردنێکی کولتوریمان لەقەڵەم دا ئێمە خۆمان داوەتمان کرد و پێشولزیمان لێکرد، ئەمەش لە رێگەی دەرگا کراوە جیاجیاکانمانەوە.

دەمێنێتەوە بڵێین کاریگەرترین ئامرازەکانی داگیرکردنی کولتورییانەی وڵاتانی جیهانی سێ – ئەگەر وێنەیەکی زۆر بێ گوناهانەش وەربگرێت وەك هەندێ لە توێژەران وای دەبینن – توشبوونی رۆشنبیرانی ئەو وڵاتانەیە بە ئیفلیجی بەبۆنەی نوقمبوونیانەوە لەو ئیش و کارانەی کە هیچ بەشدارییەك

لە پەرەپێدانی فکریيانەی سەربەخۆ بۆ ئەو وڵاتانە ناکەن و، بگرە وەك جەلال ئەحمەد ئەمین دەڵێ" ڕۆشنبیرانیشیان، لەژێر دروشمی پەرەپێداندا، بە ماشێنی فکریی ڕۆژئاواییەوە گرێدەدات .( بڕوانە: تنمیة أم تبعیة اقتصادیة و ثقافیة، ص ٨٩ ).

# تیرۆریزم و تاوانی ڕووناکبیران

## ـ ۱ ـ

تاوانی ڕووناکبیران لە مەسەلەی تیرۆریزمدا تاوانێکی گەورەیە. ئەم تاوانە ئیخوان موسلمین دەستیان پێوە دا کاتێک کە دەستیان کردە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی سیاسیی خۆیان کە بە توندی گرێدراوە بە تیرۆرەوە و، لە چلەکانیشدا( ڕێکخستنی نهێنی ) یان ( ڕێکخستنی سەربازی)یان دروستکرد، ئەو ڕێکخستنەی کە ( ئەلنەقراشی پاشا )ی سەرۆک وەزیرانی میسر و ژمارەیەکی تر لە کاربەدەستە فەرمییەکانی تیرۆر کرد و، لە ساڵی ١٩٥٤یشدا لە گۆڕەپانی ئەلمەنشییە ـ ی شاری ئەسکەندرییەدا هەوڵی تیرۆرکردنی جەمال عەبدولناسر-ی دا. هەروەها تاوانی ڕووناکبیران ئەو دەمە دەستی پێکرد کە سەید قوتب هەردوو کتێبەکەی ( معالم في الطريق ) و ( في ظلال القرآن ) و هی تری بڵاوکردەوە و

ئەویان درەوشاندەوە بۆ ئەوەی لە فکری عەرەبی و ئیسلامی هاوچەرخدا ببێت بە یەکەم بیرمەند و تیۆریزەکاری تیرۆریزم.

— ٢ —

هەروەها تاوانی ڕووناکبیرانی عەرەب لە مەسەلەی تیرۆریزمدا لەمیانەی ئەوەوە بوو کە لە پەنجاکان و شەستەکاندا زۆربەی ڕووناکبیران و بیرمەندانی عەرەب، لە ڕاست و چەپ و ناوەڕاست-ەوە، گلانە حزب و گروپ و ئایدیۆلۆژیاگەلێکی جیاوازەوە و، بەسەر ئەو گروپ و دەستە و خێڵ و عەشیرەتانەدا دابەشبوون کە کەوتنە ململانێکردن و داگیرکردنی ماڵ و حاڵی یەکتری. ئەم گروپ و خەڵکانە-ش تەنها لە ناو بیرمەندانی هاوچەرخی عەرەبدا نین، بەڵکو ئەمە دیاردەیەکی جیهانییە و لە ئەورووپا و ئەمریکاشدا خۆی نواندووە، بەڵام دیاردەی بەرچاوی ڕووناکبیرانی عەرەب لەم سەردەمەدا ئەم دەمارگیرییەیە بۆ ئایدیۆلۆژیا لەسەر حسابی هەقیقەت و، ئەم ئینتیما خێڵەکییە سیاسیی و فکرییەیە لەسەر حسابی دادخوازی. هەر ئەوەش یەکێك بوو لەو هۆیانەی کە بزووتنەوەی ئازادیخوازیی لاوازکرد و، ئەم دەماگیرییە کردی بە قەیرانێکی ڕاستەقینە کە هێشتا و تا ئێستا لە فکری عەرەبیی هاوچەخدا بوونی هەیە. لێرەوە نەبوونی ئینتیمای بیرمەندێکی دیاریکراو بە ( کۆمەڵەیەك و گروپێك)ەوە، هەروەك ڕۆمانئوسی ئوردنیی خوالێخشبوو ( موئەنس ئەلرەزاز) لە ڕۆمانەکەیدا ( متاهات الأعراب في ناطحات السراب )داوای ئەوەی لە پارتە سیاسییەکان دەکرد، یان نەبوونی ئینتیما بۆ بزووتنەوەیەکی خراپەدۆست، هەروەك شاعیر و نوسەری لوبنانی ( ئونسی ئەلحاج) داوای ئەوەی لەو تەوژم و ئایدیۆلۆژیایانە دەکرد کە لەو سەردەمەدا هەبوون ( بڕوانە : کلمات، کلمات،

کلمات ، ص٦١)، یان نەبوونی ئینتیما بە خێڵێکی سیاسی یان فکرییەوە، شتێکی کەم وێنە بوو لە شتە کەم وێنەکانی پەنجاکان و شەستەکانی ئەم سەردەمە.

ئەگەر یەکێکیش بەدی بکرابایە لە بابەت خالد محەمەد خالد، یان جەبرا ئیبراهیم جەبرا، واتە لەو جۆرە خەڵکەی کە پەیوەندیی نەکردبێ بە کۆمەڵەیەکەوە یان خێڵێکی سیاسی یان فکرییەوە، ئەوە ئەو شتە لە شانسی سەردەکە و رزقی شوێنەکە بووە، چونکە نموونەی ئەو دوو سیمبولە لە قەشەکانەوە نزیکە تا لە ئادەمیزاد، بە تایبەتی ئەو دەمەی کە ئەم دووانە سازشکردنیان رەتکردەوە و دەستگرتنی روحیی خۆیانیان بە هیچ خراپەدۆستییەك پیس نەکرد، لە ناوەندی جیهانێکی عەرەبیی بارکراو بە بانگەواز و بانگەشەکاری ئەم دوو نوسەرە خۆیان لە فریوخواردن گۆشەگیر هێشتەوە، ئەوەش لەرێگەی ئازادیی خۆیانەوە.

— ٢ —

بیرمەندی میسری حەسەن حەنەفی ـ ی دامەزرێنەری تەوژمی ( چەپی ئیسلامی ) ئەوەمان بۆ شیدەکاتەوە کە چۆن رۆشنبیری و رووناکبیران تاوانباربوون لە مەسەلەی تیرۆریزمدا و، چۆن ئەوەش بۆتە هۆی بەرزبوونەوەی کێرڤی تیرۆریزم لە جیهان عەرەبیدا و، دواتر وای لە تیرۆر کردووە ببێتە نان و هەنگوینی عەرەب، کارێك کە بووە مایەی ئەوەی دیاردەی تیرۆر ببێتە کارێکی سەرقاڵکەر بۆ بیرمەندانی هاوچەرخی عەرەب، ئەوەش لە ئەنجامی ئەو ئاسەوارە گەورە و زۆرانەی کە دیاردەی تیرۆر

بەسەر کۆمەڵگا عەرەبییەکاندا بەجێی هێشتووە و شیکردەوەیان بەم خاڵانە پوخت دەکرێتەوە:

١- سەرنەکەوتنی ئەو فکر و ئایدیۆلۆژیایانەی پەنجاکان و شەستەکان کە رووناکبیران بونیادیان نا و بانگەوازە نەتەوەیی و سوسیالیستی و ئیسلامگەرایی و شیوعیگەراییەکانیان لێ بەدەرکەوت. ئەم فکر و ئایدیۆلۆژیایانە بە تەواوەتی وشك کران و پرۆژەکانی ریفۆرم و رابوونیش دارمان، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە نەتوانرێ مامەڵە لەگەڵ سیستمی نوێی جیهانیدا بکرێت و، بگرە لەسەر ئاستی رۆشنبیری و ئایدیۆلۆژی و سیاسی و، لە بینینی جیهانیش بەرێنەی راستەقینەی خۆی، نەتوانرێت سەرکەوتن بەدەست نەهێنرێت.

٢- خراپیی پەیوەندیی نێوان رووناکبیری نوێ و ئیسلام . لەم رووەوە، ئەوەی زانراوە ئەوەیە کە ئەم پەیوەندییە پەیوەندیی رەتکردنەوەی بەردەوامی ئیسلام بوو. ئەوانەی کە لەبارەی ئیسلامەوە دەیاننوسی لە دیدی رووناکبیرانی نوێخواز و عەلمانییەکانی عەرەبدا بەوە دواکەوتنخواز و راستڕەو تۆمەتبار دەکران. بەمەش فکری رەتکردنەوە لەلامان سەریهەڵدا، فکرێك کە گفتوگۆ ناکا و باوەڕیشی بە گفتوگۆ نییە، ئەوەش لە دواییدا دیاردەیەکی وەك دیاردەی بن لادن-ی خستەوە، ئەو بن لادنەی کە گفتوگۆ ناکا و زمانی مەرگ وەك ئامرازێك بۆ گفتوگۆیەکی بێ هودە بەکاردەهێنێت.

٣- روونەدانی کودەتایەکی رۆشنبیریی لە ژیانی عەقڵیماندا و، دەست نەکردنی شارستانییەتمان بە وەرگرتنی رێڕەوێکی نوێ کە شارستانییەتی ئێمە هێشتا لە بزووتنەوەکانی ریفۆرمی ئایینیی ئەو دواییانە و، سەرەتاکانی فکری نەتەوەیی هاوچەرخەوە بەدیی دەکات و، روونەکردن بەرەو لیبراڵیزم لە فکر و لە ژیاندا، ئەو لیبرالیزمەی کە ئەویش بەو قاڵبە

زهنییە کۆنانەی ئەوروپا کە نەوەی لیبرالیستەکانی نیوەی یەکەم و سەرەتاکانی نیوەی دووەمی سەدەی بیست هێنایان، گەندەڵ بوو، ئەمەش لە دواجاردا بووە هۆی شیزۆفرینیا، شیزۆفرینیا لە کەسایەتی و ستراکتۆری فکری عەرەبیی هاوچەرخدا، هەروەها بووە مایەی دووفاقیش لە کەسایەتیی عەرەبیدا.

— ٤ —

ئەوەی گومانی تیادا نییە ئەوەیە کە ئەو پەیوەندییە تێکەڵ و پێکەڵەی لە نێوان ئیسلام و رۆژئاوادا هەیە، بووە مایەی دەرنەکەوتنی هەر خوێندنەوەیەکی هێمنانە لە واقعی ئیسلامیدا بۆ ئەزموونی سیاسی و مەعریفی لە رۆژئاوادا. بیرمەندی لوبنانی ( وەجیە قانسوە ) دەڵێ : زۆرێك وایان مەزەندە دەکرد کە دەتوانرێ مۆدێرنەی رۆژئاوا بە پارە بکڕدرێ. هی تریش وایان مەزەندە دەکرد کە بە بەریەککەوتن بەدەست دەهێنرێت، خەڵکانی دیکەش رەتیان کردەوە بەو قسەیەی کە ئەوەی هەمانە بەسمانە. بەم جۆرەش رۆژئاوا بەو ئەوپەڕە دەستدرێژکەرە مایەوە کە گومان لە نیاز و پاڵنەرەکانی دەکرێت. عەقڵی ئیسلامیش نەیتوانی ئەزموونی مەعریفی و هەڵویستی سیاسی لێك جیابکاتەوە، هەڵوێستەکانی رۆژئاوا خۆیشی و کاروکردەوەکانی بە درێژایی زیاتر لە سەدەیەك یارمەتیی بەدیهێنانی ئەو لێك جیاکردنەوەیەیان نەدا، هەر ئەمەشە کە بە ئاسانی قبوڵکردنی کەلەپووری نا دوژمنکارانەی یۆنانی لە کولتووری ئیسلامی و، سەختیی هەرسکردنی دەوڵەمەندیی مەعریفی و تەکنیکیی رۆژئاوای نوێ لێکدەداتەوە ئەمە ئەگەرچی فکری یۆنانی خۆی لە بنەڕەتدا بە ئەندازەی

بنەچە و خاڵی لەسەر راوەستانە بۆ خودی فکری رۆژئاوا. ئەم پەیوەندییە تێکەڵ و پێکەڵەش یەکێك بوو لەو هۆکارە کولتوورییە کیمیاییانەی کە دواتر لە تاقیگە تاریکەکاندا یارمەتیی کارلێککردنی دیاردەی تیرۆر و دەرکەوتنی دا.

— ٥ —

نابێ بەرگریکردنی هەندێ لە رووناکبیران و بیرمەندان لە رژێمگەلێکی سیاسیی دیاریکراو و رەخنە نەگرتنی بابەتییانەیان لەو رژێمانە و گۆرانی وتنیشیان بەبالای دەسکەوتەکانی ئەو رژێمانە لە بواری ئازادیی سیاسی و فکریدا لە بیر بکەین مادام ئەو بیرمەندانە بەشێکن لە دەسەڵاتی پیاهەڵدراو، یان لەوانەن کە لە دەزگاکانی ئەو رژێمانەوە بەخششی دارایییان وەرگرتووە، وەك ئەو شتە – بە نموونە نەك لە یەکێکدا بە تەنها – لەگەڵ نوسەری میسری ئەمیر ئەسکەندەر ـ دا روویدا لەو کتێبەیدا کە لەبارەی سەدام حسێن–ەوە نوسیوێتی ( صدام مفكراً و مناضلاً و إنساناً ) و، رۆژنامەنووسی لوبنانی فوئاد مەتەر لە کتێبەکەیدا ( صدام ، الرجل و القضية و المستقبل ) دا و، حەمیدە نەعنەع لە کتێبەکەیدا لە بارەی تارق عەزیز–ەوە ( رجل و قضية ) و دەیان نوسەر و کتێبی تر کە مێژوویان ساختەکرد و پارەیەکی زۆریشیان وەرگرت لە نرخی ئەو ساختەکردنە. هەموو ئەوانەش وایان لە خوێنەر کردووە لێی بشێوێ لەوەی ئەوانە دەیڵێن و، چیتر ـ یش هەق لە ناهەق و شەو لە رۆژ و رەش لە سپی ـ یش دیارنەبێ و دیدوبۆچوون و بیروباوەڕەکانیشی لێ تێکەڵ ببێ و لەنێوان چاو و زماندا و ئەوەی دەبینرێ و ئەوەی دەخوێنرێت سەری لێ بشێوێت.

نموونەیەکی تریش دەهێنینەوە کە توێژەر و سیاسیی سوری جۆرج جەبور–ە، ئەو پیاوەی کە لە هەشتاکاندا وەك بەڕێوەبەری نوسینگەی لێکۆڵینەوەی گشتی لە سەرۆکایەتی کۆماری سوریادا ئیشی دەکرد. جۆرج کاتێك کە کتێبەکەی دەرکرد ( الفكر السياسي المعاصر في سوريا ) بە واقعی ئازادیی لە سوریا، لە ماوەی ۱۹۷۱ و دواتریشی، هەڵداوە و، وەك مێژوونوسێکیش دەڵێ : ئاراستەی بزووتنەوەی چاککردنەوە بەرەو چاککردنی ئازادییەکانی هاووڵاتیان و ئابوورییان جەختی کردووە و یەکێك لە ئاکامەکانی ئەم جەختکردنەش هەڵوەشاندنەوەی زۆرێك لەو ڕێوشوێنە داپڵۆسێنەرانە بوو کە هەبوون، ئاسەواری گەشەکردنی ئازادیەکانیش لە زۆر بواری ژیانی و فکریدا تێبینی کراوە ( الفكر السياسي المعاصر في سوريا ، ص ۳۰۲ ).

هەروەها چوونی هەندێ لە ڕووناکبیران بۆ پاڵ دیکتاتۆریی عەرەبی و بەرگری کردنیان لێیان بە شێوەیەکی توند وگەرم و گوڕ و لەسایەی ئائامادەگیی هۆشیاریدا، یەکێك بوو لە هۆکارەکانی قەیرانی ئازادیی عەرەب بە تایبەتی لە پەنجاکان و شەستەکاندا کاتێك کە زۆربەی ڕووناکبیرانی عەرەب لە چەپەوە بۆ ناوەڕاست و بۆ ڕاست کەوتبوونە تەپڵ و دووزەلە و هەلهەلەلێدان بۆ جەمال عەبدولناسر ئیتر سەرکەتوو بووبێت یان تێکشکاو، هەڵکشاو بووبێت یان داکشاو، دادپەروەر بووبێت یان ستەمکار، لەسەر ڕاست بووبێت یان هەڵە. کاتێکیش کە جەمال عەبدولناسر لە پەنجاکاندا حزبەکانی هەڵوەشاندەوە و ڕێبەرەکانیانی خستە دەستگیرخانەو زیندانەکانەوە و ڕای ئەویتری ڕەتکردەوە و ئۆپۆزسیۆنی سەرکز کردو، پاشان میساقی ساڵی ۱۹٦۲ی هێنا و بەرگێکی نوێی بە بەر تاکە حزبیی دیکتاتۆریدا دابڕی، هەندێ لە ڕووناکبیرە دەرکەوتووەکان کەوتنە هەڵە هەڵە

لێدان بۆی و، لەو دەمەدا لەسەر زاری رەجا نەقاش بە عەبدولناسریان ووت : دەستەکانت خۆش بێت، هیوامان و بگرە هەموو هیوایەکمان لەو یەکێتییە سۆشیالیستییەیە کە بە ئومێدین پشتیوانی مەعنەویی بەرز و بالأمان بێت بە تایبەتی لەم قۆناغەدا کە تیایدا هەڵکشانی شۆڕشگێڕانەی عەرەب گەیشتۆتە پلەیەك لە بە هێزی کە هەرگیز شتی وا بۆ نەتەوەی عەرەب نەڕەخساوە رەنگە لە شۆڕشی ئیسلامییەوە تا ئەمڕۆ ( التنظيم الشعبي و الثورة الفكرية، مجلة الآداب، عدد ٩، بيروت، ١٩٦٢). لێرەشدا روونە کە رەجا نەقاش مەبەستی لە شۆڕشی ئیسلامی لێرەدا دەرکەوتنی ئیسلامە، بەمەش رەجا نەقاش بایەخی گرنگی دەرکەوتنی عەبدولناسر و شۆڕشەکەی لەگەڵ گرنگیی دەرکەوتنی ئیسلام و شۆڕشەکەی هاوشان دەکات. هەر ئەمەش چەند لایەنێکی تاوانی روناکبیران و بەشداریکردنیانە لە دیاردەی تیرۆریزمدا، دیاردەیەك کە ئێستا هەموومان بەدەستیەوە مەینەتی دەچێژین.

# بۆچی گەلانی عەرەب وەك سەگەكەی دیستۆفیسكی ـ یان لێهاتووە ؟

ـ ١ ـ

ئەگەر مێژووی دووروودرێژی عەرەب، لە سەردەمی معاویە بن ئەبی سوفیانەوە تا ئێستا، بخەینەڕوو، ئەوە دەبینین گەلان عەرەب بە مۆركی پاشا و خەلیفە و حوكمڕانەكانیان مۆركیان گرتووە، بە جۆرێك كە بوونەتە بەشێكی سروشتی و ئۆرگانیی ئەو دەسەڵاتدارێتیەی كە لە ئارادا بووە: بۆ خۆشیی ئەو، خۆشی دەكەن، بۆ دڵتەنگیشی دڵتەنگ دەبن و لێبڕاوانە ئەوەش ڕەت دەكەنەوە كە حوكمڕانەكەیان واز لە حوكمڕانی بهێنێ ئیدی بەبۆنەی نەخۆشییەكەوە بێت یان دەردێك یان سەرنەكەوتنێك یان شكستهێنانێك تەنانەت ئیتر ئەگەر لە هەقیش لای دابێت، یان ستەمكاربێت، یان سەركوتكەر. گەلانی عەرەبی واشیان لێهاتووە ڕوخساری خۆیان نابینن تەنها لە ئاوێنەی حوكمڕانەكانیانەوە نەبێت، ئەمە ئەگەرچی ئەو

حوکمڕانانه، بەکۆ، دڵڕەقانەترین جۆری زۆرداری و ستەمکاریشیان بەسەر گەلانیانـدا ئەنجامـدا بـە جۆرێـك کـە ئـەم گەلانـە هـیچ شارسـتانییەتێکی بازرگانی، یان زانستی، یان پیشەسازی، یان ڕۆشنبیریی عەقڵگرتوویان، بۆ جیهان، نەخستەوە. شارستانییەتی عـەرەبی- ئیسلامییش کە بە درێـژایی چواردە سەدە و زیاتریش تا ئێستای گەیاندوین، وەك دەڵێن، لە کۆششێکی کەم بەولاوە هیچی دی نییە، واتە کەمترین شتە کە بەدی بێت بۆ گـەلانێك بە درێـژایی ئـەو سـەردەمە دوورودرێـژە. ئەگـەر لـە جیهـانی عـەرەبی و ئیسلامیـشدا کـەمێك ئـازادی و دادگـەری هەبووایـە ئـەوە بەخـشندەیی مرۆییانەی عەرەب زۆر لەوە زیاتر دەبوو لەوەی کە ئێستا لە باب و باپیرانی یەکەممانەوە بۆمان ماوەتەوە.

بەهەمان حاڵ ئێستا دۆخی جیهانی عەرەبیش ئاوهایە. زۆربەی گەلانی عەرەب مۆرکی حوکمڕانەکانیان گرتووە. لەم ڕووەوە دەیانبینین کە بە نیوە تـەواوی چـوونەتە پێـستی حوکمڕانەکانیانـەوە. دەسـتەواژەکانی حوکمڕانەکانیـشیان دەڵێنـەوە، بـاوەڕیش بـەوە دێـنن کـە حوکمڕانـەکانیان باوەڕیـان پێیـەتی، ڕقیـشیان لەوەیـە کـە ئـەوان ڕقیـان لێیـەتی، ئەوەشـیان خۆشـدەوێ کـە ئـەوان خۆشـیان دەوێ، هـەوڵیش دەدەن - ئەگـەر پـارەی ئەوەیان هەبێ - ئەو جلوبەرگە لەبەر بکەن کە ئەوان لەبەری دەکەن و، ئەو شتە بخۆن کە ئەوان دەیخۆن.

کەسایەتیی گەلانی عـەرەب بە تـەواوەتی سـڕاوەتەوە، بگـرە بونیـشیان سڕاوەتەوە. ئەوە کەسایەتیی دەسەڵاتدارێتی عەرەبە کە بۆتـە نیشتمان نـەك تەنها بووبێتە گەل، جگە لەوە، ڕەخنەگرتن لە دەسەڵاتدارێتی عـەرەب بۆتـە ناپـاکی، وای لێهـاتووە بەمانای ڕەخنـە گرتنە لـە نیشتمان و خیانەتکردنـە لێـی. ئەمـەش لەبـەر ئـەوەی دەسـەڵاتدارێتیی عـەرەب وای لێهـاتووە بۆتـە

خاوەن و خاوەندار . ی هەمیشەیی نیشتمان نەك حوكمڕانی گۆڕاو و ئالوگۆڕكراوی نیشتمان. ئەمە لەكاتێكدا تەنها دەستاودەستكردنی دەسەلات بوو لە ولاتە دیموكراسییەكاندا كە بواری ئەوەی دا بەرەخنەیەكی تالّ و بەردەوام، ڕەخنە لە دەسەلاتداریّتی بگیریّ و، نیّوانی دەسەلاتدارێتیشی، وەك حوكمڕانییەكی كاتی و، دەسەلاتدارێتی وەكو خاوەندارییەكی درێژە كێشاو، جیاكردەوە.

— ٢ —

لە عیراقیشدا، لەو دەمەوەی كە دەولەتی عەباسی لە بەغدا دامەزرا و پێش ئەویش دەولەتی ئومەوی و تارۆژی ئەمڕۆشمان، هەر هەمان حالّ لە ئارادابووە. لەم رووەوە، لە ١٢٥٠ سالەوە، كە ئەمەش سەدەگەلێكی دووردرێژە كە تیایدا عەباسییەكان و، مەغۆل و، عوسمانییەكان و، پاشاكان و، كۆمارییەكانی بەعسییەكان بەدوای یەكدا حوكمی عیراق دەكەن، گەلی عیراق دێت و بە تەواوی دەچێتە پێستی حوكمڕانەكانییەوە، ئەمە بە جۆرێك كە ئەو حوكمڕانانە كەسایەتیی گەلی عیراقییان سڕیوەتەوە و نەیانهێشتووە لە پێكهێنانی كەسایەتیی خۆیدا ئازادبێ. ئەوەی نوسینەكانی فەیلەسوفی كۆمەلایەتیی عیراق (( عەلی وەردی )) یش بخوێنێتەوە كە بە ئەندازەی ( ئیبن خەلدون)ی عیراقە، تێبینی ئەوە دەكا كە كاریگەریی حوكمڕانە یەك لە دوای یەكەكانی عیراق لە پێكهێنانی كەسایەتیی عیراقیدا، چەند تۆقێنەرە.

بۆ نموونە، گەلی عیراق ئەو توندوتیژییە سیاسییەی بەخۆوە گرتووە كە ئێستا دەیبینین، لە رابردووشدا لە شۆڕشی ١٩٥٨ بەسەر سەردەمی

پاشایەتیدا، لە دیمەنی توندوتیژیی سیاسییدا بەدی دەکەین. لە سەردەمی ئومەوی و عەباسی و ئەوەی کە لەدوای ئەوانیشەوە هاتن، هەر لە گۆڕێدا بوو. ڕووداوی لە سێدارەدانی سەدامیش لە بەرەبەیانی ڕۆژی جەژنی قورباندا ڕووداوێکی نوێ و تاك و تەرا و کەم وێنە نەبوو لە مێژووی عیراقدا. لەم ڕووەوە، لەلایەن والی بەغداوە ( خالد ئەلقەسری) لە سەرەوەختی خەلیفەی ئومەوی ( هیشام بن عەبدولمەلیك)یشدا، واتە بەر لە هەزار ساڵ و هەر لە ڕۆژی جەژنی قورباندا و دوای نوێژی جەژن و لە مزگەوت و لە ژێر سەکۆی مزگەوتەکە و بە شمشێری خودی خالد ئەلقەسری - ی والی بەغدا، سەری بەرهەڵستکار و بیرمەندی موعتەزیلە ( جەعد بن درهەم) پەڕێنرا. ئەمە سەرباری ئەو دیمەنانەی توندوتیژی کە لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی عەباسیدا لە بەغدا کەوتنەوەو خەلیفە ( ئەبو عەباس عەبدوڵلا) فەرماندەیی دەکردو، دوای ئەویش خەلیفە ( مەنسور) لەسەری ڕۆیشت و لە میانەیدا گۆڕی ئەمەوییەکان هەڵکەنران و، ئەوانەشیان کە مابوون، بە شێوەیەکی توندوتیژ کە پێشتر شتی وا ڕوونەدابوو، کوژران.

## — ٣ —

سەیرە، ئەوپەڕی سەیرە، کە سەدام پێشبینی ئەوە بکا بە مەرگی پاڵەوانان بمرێت نەك بە مەرگی ستەمکارە سەرکوتکەرەکان و لەسەر شێوازی تەقلیدییانەی عیراق کە شێوازی پەلکێشان و ڕاکێشانە. سەیرە پێشبینیی ئەوەش بکات کە مەراسیمێکی میللیی مێژوویی بۆ بەڕێوەبچێت، مەراسیمێك کە عیراق شتی لە نموونەی ئەوەی بەخۆوە نەدیوە. سەدام

هەرگیز وێنای ئەوەی نەدەکرد کە بەو شێوە ئابڕوشکێنە بمرێت، شێوەیەك کە پێشتر هیچ حوکمڕانێکی عەرەبی، ستەمکار بووبێ یان دادخواز، پێی نەگەیشتووە.

ئەو وای وێنا دەکرد کە ڕۆژێك لە ڕۆژان تیرۆر بکرێت ( إغتيال) بەلأم لەوێناکرنیدا نەبوو کە بەو جۆرە هەڵبواسرێت.

کە بەرهەڵستکارانیشی پەتی پەلکێشکردنیان لە شەقامەکانی بەغدادا بۆ ئامادە دەکرد، هەروەك ئەو کارە لەگەڵ ڕەمزەکانی سەروەختی پاشایەتیی پێشووشدا کرا، ئەو وای وێنادەکرد کە لە گۆشەگیریی ئەودا کودەتایەکی دیاریکراو سەربکەوێ نەك بەو جۆرە هەڵبواسرێ. ئەگەر ئەمریکاش لە عیراقدا بوونی نەبووایە، ئەوە لەو حاڵەتدا مەرگی سەدام لەسەر شێوازە عیراقییە لەسەر ڕاهاتووەکە بەڕێوەدەچوو کە ڕاکێشانێتی لە شەقامەکانی بەغدادا. بەو جۆرە شارستانییەش دادگایی نەدەکرا و بەو شێوە پێشکەوتووەش، وەك لویسی شازدەهەم، هەڵنەدەواسرا، ئەو لویسەی کە جەلادەکەی ( تشارلز سانسۆن) لە بارەیەوە وتی: لویس بە کەرامەتی خۆیەوە مرد و لە مردن نەترسا. ئەو لویسەی کە ووتبووی : (( هیوادارم خوێنی من شادیی فەرەنسا بەهێز بکا))، ئەوە ئەو شتەیەی کە سەدامیش ووتبووی :(( هەڵدەواسرێ، بە قوربانی بۆ عیراق )). دەوترێ کە لویسی شازدەهەم ئازاش بووە لە مەرگیدا، هەروا سەدامیش، هەر ئەوەشە کە پاڵی نا بە معەمەر ئەلقەزافی لە پاڵ پەیکەری موجاهیدی لیبیا، عومەر موختار، پەیکەرێکیش بۆ سەدام بکرێت وەك پاداشتێ بۆ ئازایەتیی سەدام !!.

## ـ ٤ ـ

نوسـەری عیراقـی فـالح عەبدولجەبار دەڵـێ سـەدام حـسێن دەیوست بـەو شـێوەیەی خـۆی حـەزی لێیـەتی بمرێـت، ئەمـەش دوای ئـەوەی کـە تەمـەنی دەگاتـە نـەوەد یـان سـەد سـاڵ. سـەدام چارێکیـان ئەنـدازیاری یـەکێك لـەو مزگەوتە گەورانەی، کە لە ڕۆژگاری ئابلۆقەی ئابووریی سەر عیراق دروستی کردبـوون، لەسـەر بـەرزیی پلەکانـەی بـەردەکانی مزگەوتەکـە سەرزەنـشت کردبـوو چـونکە زیـاد لـە پێویـست بـەرزن و، وەك وتبـووی، لەگـەڵ تەمـەنی پیرێتیی داهاتووی ئەودا ناگونجێن و: باب و باپیرانی ئەو، وەك سەدام خۆی وای ئیدیعا کردبوو، تەمەن درێژبوونە. سـەدام ئامادەیی ئـەوەی دەکرد وەك هـەر فەرمانبـەرێکی حکـومی دوای نـەوەد ساڵی خـۆی خانەنشین بکـا. وەك ئەبتەر ـ ی پاشا ـ ش ئامادەکاریی بۆ هەتاهەتایەتی خۆی دەکرد تا دەستی لەپشتی گۆڕەکەشییەوە درێژ بکات. لەم ڕووەوە، بڕیاری دامەزراندنی کوڕە هەرە بچووکەکەی وەك میراتگری کۆماری خێڵ دەرکرد و، ئەو وانەیـەی ئیبن خەلدون ـ ی لـە بیرکرد کـە دەڵـێ: ڕاسـتە سـەرداریێتی سـەربە کۆمەڵـە، بەڵام پاشا بە ڕۆشتنی دەڕوا.

ناشـزانم عـەقڵی سـەدام چ عـەقڵێك بـوو کـە وا وێنـا بکـا ئەوانـەی کـە ڕۆڵـەکانی کوشـتن و ژن و منداڵـەکانی ڕفانـدن لێـی خـۆش بـبن. ئـەوێك کـە هـەزاران گونـدی عیراقـی ڕوخانـدبێ و دوو جـەنگی یـەك لـە دوای یەکیـشی دۆڕانــدبێ: مردنــی وەك مردنــی پیــاوە مەزنــەکان بێــت و ڕێــوڕەسمی تەرمەکەشـی وەك ڕێوڕەسمی فاتحـەکان ( الفاتحین) بێـت؟ سـەدام ئـەوەی لـە حساباتدا نەبوو کە گەلی عیراقی بێ توانا، بێ توانا لەوەی تۆڵـەی خۆیانی

لێ بکەنەوە، خودایەکیان هەیە کە لە بری ئەوان تۆڵەی لێ دەکاتەوە و لە ژیان و مردنیدا زەلیلی دەکا وەك چۆن ئەو گەلی عیراقی زەلیل کرد و دوورخستەوە. نوسەری عیراقی (عادل حەبە) ووتبووی: ئەم پیاوە دەرکەوتووترین کەس بووە و لە پێشی ئەوانەشەوە بووە کە رەواجپێدەری رێبازی دەلالی - ی سیاسی ( البلطجة السياسية ) بووە لە نیو سەدەی رابردووی عیراقدا . لەم رووەوە، سەدام حسێن یەکەمین کەس بوو کە لە دوای چەند هەفتەیەك لە هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨دا کردەوەی تیرۆری سیاسیی ئەنجامدا.

— ٥ —

سەدام ژیا و بە هەڵواسینی خەڵك حوکمی کرد، هەر بە هەڵواسینیش مرد. ئەوەش لە مێژووی ئادەمیزاددا چارەنووسێکی کەم وێنە نییە بەڵام چارەنووسێکی کەم وێنە و دیارە لە مێژووی عەرەبدا.

ئەو کە بەر لە سی ساڵ هەڕەشەی لە عیراقییەکان کرد کە عیراق بەجێ ناهێڵێ تەنها بە کاول و وێرانەیی نەبێ، بەڵێنەکەی خۆی هێنایە جێ، ئەوەتا تاقمەکەشی لە عیراق و بە پشتگیریی هەندێ وڵاتی دراوسێ هەموو رۆژێ ، لە ناوەڕاست و باشووردا، عیراق وەردەگۆڕن بۆ خاکێکی کاول و قەسابخانەیەکی قێزەوەنی مەرگ و، بۆ گەلێك لە سواڵکەر و خورافەت و جادوگەریی فرۆش ئەمە دوای ئەوەی کە دەوڵەتی مەدەنی ڕما و داروخا.

عیراق و گەلی عیراق گۆڕاون بۆ شتێك کە لە سەدام دەچێ دوای ئەوەی بە درێژایی سی ساڵ چوونە پێستی ئەم ستەمکارەوە، ئەوە هەر هەمان شتیشە کە لە هەندێ گەلانی عەرەبیشدا روویدا، ئەمەش رۆمانەکەی

رۆماننوســی روســی دیستۆڤیــسکی ــــ مــان بیردەخاتــەوە، رۆمــانی (زەلیلکراوەکان و ئابڕوشکێنراوەکان )کە چۆن یەکێ لە کەسایەتییەکانی رۆمانەکەی ( ئەخمینیڤ) کە پیرمێردێکی بەساڵاچووە، وای لێهاتووە خۆی و سەگەکەی رەنگیان یەکیان گرتووە بە بۆنەی ئەوەی زۆر لەگەڵ یەکدا ژیاون و پێویستییان بەیەك بووە. ئەم بە پێستەوەچوونە دڵرەقەش ـ کە ئەوە نەخۆشییەکی ترسناکە ـ کاتێکی دووروودرێژ و چارەسەرێکی قوورسی لەگەڵی عیراق دەوێ، تاوەکو لێی ببێتەوە.

# ئایا کۆلۆنیالیزم دەگەڕێتەوە بۆ جیهانی عەرەبی ؟

چپەیەکی لەسەرخۆ لەنێوان دەستەبژێرێك لەڕۆشنبیران و هەروەها لەنێوان خەڵکی عەوامدا هەیە کە ڕەحمەتی ڕۆژگاری کۆلۆنیالیزم دەکا لە وڵاتی شام و میسر و بەری ڕۆژئاوای عەرەبی. ئایا ئێستا هەندێ لەخەڵکی عەرەب هیوای گەڕانەوەی کۆلۆنیالیزم دەخوازن دوای ئەوەی کە گەندەڵیی دارایی و زۆرداریی سیاسی و ناهەمواریی ئابوری و داپڵۆسینی کولتووریی زۆریان لەلایەن (( دەوڵەتی سەربەخۆی))ەوە چەشت کە لەدوای ڕۆیشتنی کۆلۆنیالیزمەوە هات؟.

ئایا ئێستا، دوای ئەو نائومێدییانە، هۆکارگەلێکی یارمەتیدەر لەجیهانی عەرەبیدا هەن یارمەتیی گەڕانەوەی کۆلۆنیالیزم بۆ جیهانی عەرەبی بدەن ؟

یەکەمجار وا دەردەکەوێت کە ئێستا گەڕانەوەی کۆلۆنیالیزم بۆ زۆر ناوچەی جیهانی عەرەبی ئاسانتر بێت لەوەی کە پێش ساڵی ۱۹۹۱ هەبوو و

پێش ئەوەی کە یەکێتیی سۆڤێت لەنەخشەی سیاسیی جیهاندا لەبەرچاو ون ببێت، چونکە ئێستا جیهان لەچنگی تاقە زلهێزێکدایە و، بڕیاری نێودەوڵەتیش لەجیهانی ئەمڕۆدا یەك بڕیارە. لێرەوە دەنگی ئەو نووسەر و رۆشنبیرانەی رۆژئاوا بەرزبووەوە کە بانگەشە دەکەن بەوەی کاتی ئەوە هاتووە کۆتایی بەلایەنەکانی سەدەی بیستەم بهێنرێت و دەست بکرێت بە تەگبیرکردنی ئەو رێوشوێنانەی کە مسۆگەرکردنی سەقامگیرییەکی گەردوونی و خۆشنوودییەکی فراوان دەگرنەئەستۆ. هەنگاوی یەکەمیش سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی ئیمپریالیزمی رۆژئاواییە وەك ئیدوارد سەعید (لەسەرنجەکانیدا لەسەر رۆژهەڵاتناسی .. ل١٦) لە بۆل جۆنسۆن ـ ەوە گواستوێتیەوە لەکتێبی ( ئیمپریالیزمی لەدەستچوو/ الإمبريالية الضائعة).

ئەو رۆشنبیرە رۆژئاواییانە دەڵێن: سەرلەنوێ دامەزراندنی ئیمپریالیزمی رۆژئاوا لەسەر کۆڵەگەی حەوت دانایی دەوەستێ کە کۆڵەگەکانی دانایی لۆرانس . ی عەرەبمان بیردەخاتەوە کە چۆن مێژوو سەرلەنوێ دووبارە دەبێتەوەو چۆن کۆلۆنیالیزم پێستی خۆی تازە دەکاتەوە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ بگەڕێتەوە بۆ ناوچەکە، ئەو کۆڵەگانەش ئەمانەن :-

١- گێڕانەوەی رۆڵی نەتەوەیەکگرتووەکان و ئەنجوومەنی ئاسایش وەك دەستێکی درێژ بۆ هێزە رۆژئاواییەکان.

٢- وەرچەرخاندنی ئاسایشی بەکۆمەڵ لە هێزێکی نێگەتیڤەوە بۆ ( سەگێکی پاسەوانی)ی بێدار.

٣- جێگیرکردنی ماف دەستێوەردان لەکاتی پێویستدا و وەدەرنانی خەیاڵخوازی و ( خورافەتی سەربەخۆیی).

٤- کارکردن بۆ لەخۆگرتنی چین و سەرلەنوێ ئاراستەکردنی لە تەقنیەگەلێکی پۆزەتیڤی بونیادنەر.

٥- بردنـی چین بـۆ نـاو سیـستمی وڵاتـە پیـشەسازییە گـەورەکان و ئابوریی نێودەوڵەتی.

٦- پــەروەردەکردنی مرۆڤایــەتی بــەپێی رێــساکانی لیبراڵیزمــی رۆژئاوایی.

٧- پاراستنی داهاتەکان و باش بەکارهێنانیان.

هەرچی ئەو هۆکارانەن کە لەپاشەڕۆژدا یارمەتی گەڕانەوەی کۆلۆنیالیزم دەدەن بۆ جیهانی عەرەبی، ئەوە دەتوانرێ لەمانەدا دەست نیشان بکرێن:

١- بـوونی نـەوت لـەجیهانی عەرەبیـدا هۆکـارێکی گـرنگ دەبێـت لـەهۆکارەکانی گەڕانـەوەی کۆلۆنیـالیزم بـۆ جیهـانی عـەرەبی ئەگـەربێت قـەیرانی ووزە توندتربێت و ئـەو وڵاتـە عەرەبییانـەش کـە نـەوت بەرهـەم دەهێـنن بـیر لەبـەکارهێنانی نـەوت بکەنـەوە وەك چـەکێکی سیاسـی لـە دواڕۆژدا. لـەم بـوارەدا یـەکێك لەبەرپرسـە رۆژئاواییـەکان دەڵـێ: ئـەوە چ هەقێکــە کــە وڵاتــە هــەناردەکانی نــەوت یــاری بەچارەنووســی هــەموو شارستانییەتی رۆژئاواوە بکەن؟ ئایا لەتواناندا نییە کە مەسـەلەیەك دروست بخوڵقێنرێـت هـەموو مەرجـەکانی رازیکـردن و تونـدوتۆڵیی لۆژیـك و هێـزی بیـانووی ئـابووری و پاسـاوکاریەکانی سیاسـەت-ی تێـدابێت کـە داوا لـەرۆژئاوا بکـا بـۆ سـەرلەنوێ کۆلۆنیـالیزەکردنی ئـەو ناوچـەیەی کـە بـە ئەندازەی دەماری شاخوێنبەر بۆ هەموو بەرژەوەندییەکانی جیهـانی رۆژئـاوا؟ ئەوەتا ئێمە ئێستا گەواهی بۆ ئەوە دەدەین کە کە چۆن نەوت بەخـەروارێك پـارەی زۆرو زەوەنـدە وەك لـەرابردوودا لـەماوەی نێـوان ١٩٧٤- ١٩٨٢دا هــەبوو و زیـاتریش لەگـەڵ زیـادبوونی بەرزبوونـەوەی نرخـەکانی نـەوت بەجۆرێك کە کەناڵە سنوردار و بەرتەسکەکانی سەرمایەگوزاریی-ی جیهانی عەرەبی نەتوانن لەخۆیان بگرن، لەکاتێکدا کە کەناڵەکانی سـەرمایەگوزاریی

دارایی لەرۆژئاوا کراوە و زۆر و زەوەند و فراوانن بۆ لەخۆگرتنی ئەو جۆرە پارەوپولانە. هەر لێرەوە رۆژئاوا هەوڵ بۆ راکێشانی ئەو پارەوپولانە دەدات، ئەمەش لەچوارچێوەی ستراتیژە تازەکانیدا کە ناوی یەکێکیانی ناوە ستراتیژییەتی(( هاوردەکردنی زێدە سەرمایە))، ئەمە لەکاتێکدا رۆژئاوا پارەوپولی زیاکردووی نییە تاوەکو سەرمایەگوزارییان پێوە بکا لەجیهانی عەرەبیدا کە خاوەنی کەناڵە بەرتەسك و سنوردارەکانی سەرمایەگوزارییە. دەشێ هەر ئەمەش بێت ئەو بازدانە زۆرەی بواری خانوبەرەمان لەناوچەی کەنداو و هەندێ لەوڵاتانی عەرەبیی دەوردراوسێدا بۆ لێك بداتەوە کە ئەو بازدانەمان بیردەخاتەوە کە لە ماوەی ساڵانی ١٩٧٤-١٩٨٣دا روویدا. ئەو دۆخەش لەوە کەوتۆتەوە کە تیایدا کەناڵی خانوبەرە و بازرگانیکردن بەپارەوە تاقە کەناڵی سەرمایەگوزاری بووە کە دەتوانێ بەشێك لەو پارەو داهاتانەی نەوت لەخۆ بگرێت. ئەمە سەرباری ئەو بازرگانیکردنانەی کە ئێستا لەبازاڕەکانی دراودا دەکرێن ، کارێك کە وای لەئابوریناسی بەناوبانگی ئینگلیزی (( جۆن کینز)) کرد ناوی ئەم جۆرە ئابورییە بنێ ((ئابوریی گازینۆ)). ئەم دیاردەیەش بۆ ئابوریی عەرەبی بووە مایەی زیان و هەڵوسان و پێشتریش مایەی زۆر قەیرانی ئابوری" لەوانە قەیرانی بازاڕی بەناوبانگی(مەناخ) لە کوەیت کە لەپای ئەو قەیرانەدا بازاڕی دراو لەکوێتدا داڕما، رووداوی تازەش ئەوەیە کە ئەو دیاردەیە بووە مایەی داڕمانی بازاڕی دراو و بە دەیان ملیار دۆلاریش زیانی گەیاندە وەبەرهێنەرە بازرگانیکارە بچووکەکانی ئەو بازاڕانە.

٢- کاتێك کە کۆلۆنیالیزم جیهانی عەرەبی-یان بەجێ هێشت، عەرەب وایان مەزندە کرد کە" هەر لەگەڵ ئەوەی کۆلۆنیالیزم لەناوچەکەدا دەچێتە دەرەوە ئیتر جیهانی عەرەبی ئامادەباش دەبێت بۆ ئەوەی بچێتە دەورانی

ئازادی و دیموکراسی و حەسانەوەی ئابوری و کرانەوەی کۆمەلایەتی و کولتورییەوە. واشیان مەزەندە کرد کۆلۆنیالیزم لەرابردوودا هۆکارێکی چەپاندن و دەستگرتن بووە بەسەر ئازادییەکاندا و بلاوبوونەوەی زۆرداری و ستەمکارییش. دیموکراسیی سیاسییش لەجیهانی عەرەبیدا روناکیی بەچاو نەبینیوە بەبۆنەی بالادەستی کۆلۆنیالیزم و لەسێدارەدانی سەرکردە سیاسییەکان و توڕدانی بەرهەڵستکاریی سیاسی بۆ ناو تونی زیندانەکان لەلایەن ئەم کۆلۆنیالیزمەوە. برسێتی و دواکەوتوویی و نەزانی-یش دیارترین دەرکەوتەکانی کۆلۆنیالیزم بوونە بەدرێژایی سەروەختی سالانی ۱۹۱۸-۱۹۷۰ و، جیهانی عەرەبی لەمیانەی ئەو ماوەیەدا لەهەموو لایەنەکانی ژیانەوە، ناهەمواریيەکی گەورەی بەخۆوە بینیوە.

بەلام زۆرێك لەرۆشنبیران توشی کارەساتێکی گەورە و نائومێدیەکی تۆقێنەربوون لەناست دەوڵەتی نیشتمانیدا کاتێك کە بینییان کۆلۆنیالیزم جیهانی عەرەبی بەجێ دەهێڵێ و دەوڵەتی نیشتمانی کاروبارەکان دەگرێتە دەست و لەوێوە ژیانی سیاسی لەجیهانی عەرەبیدا بەپلەیەکی خراپتر نالەبار دەبێت لەوەی کە لەرۆژگاری کۆلۆنیالیزمدا هەبوو. ئازادییەکانیش بەشێوەیەکی درێوتر لەوەی لەرۆژگاری کۆلۆنیالیزمدا هەبوو دەستیان بەسەرداگیرێت. ئەگەرچیش پێشتر کۆمەڵگای رۆژهەلاتی، ئازادی-ی، بەمانای تازەکەی، بەخۆوە نەدیوە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کویلەکردنی لەسەر دەستی فەرمانڕەواکانی، شتێکی تر بوو، وەك منیف ئەلرەزاز - ی بیرمەندی سیاسیی ئوردن دەڵێت، شتێك بوو شۆڕشێکی بەکۆمەڵی لەپێناوی ئازادیدا لێ نەخواست وەك ئەوەی کردی کاتێك کەکۆلۆنیالیزمی رۆژئاوا کۆیلەی کرد.

گەندەڵی سیاسی و کارگێڕی و کۆمەڵایەتی لەدەوڵەتی نیشتمانیدا بەشێوەیەکی گەورەتر لەوەی لەڕۆژگاری کۆلۆنیالیزمدا هەبوو بڵاوبووەوە، خەڵکی لەڕۆژگاری کۆلۆنیالیزم زیاتر برسی بوو، ڕێژەکانی نەخوێندەواریش لەجیهانی عەرەبیدا، وەك ئەوەی کە لەڕۆژگاری کۆلۆنیالیزمدا هەبوون، وەکو خۆیان دەمێننەوە.

# ئایا تیرۆریزم
# رەگ و ریشەی کۆمەڵایەتیی هەیە ؟

زۆرن ئەوانەی کە پێیان وایە ئەمریکایە هۆکاری سەرەکیی تیرۆریزم لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، دەشێت مەسەلەکە وابێت، بەڵام پێویستە ئەوە لە بیر نەکەین کە تیرۆریزم هۆکاری رۆشنبیری و ئاینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی ـ ی عەرەبیشی هەیە و ئەوەی کە نکۆڵیش لەم هۆکارانە دەکات دەکەوێتە هەڵەیەکی گەورەوە. لەم وتارەدا هەوڵ دەدەین بە هەندێ لەو هۆکارە کۆمەڵایەتییانە ئاشنا بین کە بوونە مایەی بەرزکردنەوەی کێرڤی تیرۆریزم لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

حەلیم بەرەکات ـ ی کۆمەڵناسی سوری ـ ئەمریکی، دەڵێ: کۆمەڵگەی عەرەبی کۆمەڵێك بەها بەڕێوەی دەبا کە رێگرن لەبەردەم پێشکەوتنی مۆدێرنە تێیدا. رەنگە هەر ئەم بەهایانەش لە کۆی ئەو هۆکارە کۆمەڵایەتییانە بووبن کە کێرڤی تیرۆریزمیان لە جیهانی عەرەبیدا بەرزکردەوە. ئەم بەهایانە یارمەتیی بڵاوبوونەوەی بنەڕەتخوازیی ئاینی

(الأصـــولية الدينيـــة ) دەدەن و تیرۆریـــزمیش لـــەژێر عـــەبای ئـــەم بنەڕەتخوازییـــەوە هاتۆتـــە بـــوون. دەشـــتوانرێ ئـــەم بەهایانـــە لـــە بـــەها قەدەرییەکانـــدا کۆبکرێنـــەوە، نـــەك بـــەهاکانی خولقانـــدن و زاڵبـــوون بەســـەر دەوروبەردا. هەروەها لـە بـەهاکانی پێشینەخوازی ( السلفية ) داخراودا کـە سیستمی سیاسیی لێوە دێتە بوون و، لە بەها خێرا و حەماسی و سەرپێی و هەڵچووە نامیتۆدییەکان و، بەهاکانی بە باشتر زانینی دەسکەوتە کاتییەکان لـە دەسـکەوتە دوورمـەوداکان و، بـەها ئاینییە رەهـا نارێژەییـەکان و، بـەها خێزانـی و بنەماڵەییـە نـا نیشتمانی و ناتاکگەراییـەکان و، بـەها خودییـە تایبەتییـە نابابـەتی و نـا گـشتییەکان و، بـەها سـتوونییە خـاوەن هێمـا چینایەتییە ناناسۆییەکان و، ئەو بەهایانەی کە شارەزایی و تەمەن بە باشتر دەزانـن نـەك گـەنج و زانـستی باشترناسـی و، ئـەو بەهایانـەی کـە هـانی هاوردەکردنی وەرگیراوە لە قوتونراوەکان دەدەن نەك وەرگیراوە فکرییـەکان ..( *بڕوانـە کتێبـی : سیـستمی سیاســی لــە نێـوان بــەها شارســتانییە ســوننەتی و مۆدێرنەکان*).

جـا ئایـا ئـەم بـەها کۆمەڵایەتییانـە بەشـێوەیەکی، دوور یـان نزیـك، بەشـداریی لـە بەرزکردنـەوەی کێرڤـی تیرۆریزمـدا هـەبووە لـە کۆمـەڵگای عەرەبیدا؟ وەڵامدانـەوەی ئـەوە ئەگـەرێکی گـەورە هەڵـدەگرێ کـە ئـەویش ئەوەیـە ئەگـەر ئەم بەهایانـە لـە نزیکـەوە بەشـدار نەبووبن ئـەوە لـە دوورەوە بەشـداربوونە. بـەڵام تـەنها ئـەم بەشـدارییە نییـە کـە کێرڤـی تیرۆریزمـی لـە کۆمەڵگەی عەرەبیدا بەرزکردۆتەوە، بەڵکو کۆمەڵێك هۆکاری تریش هـەن کـە لـەم بـوارەدا بەشـدارییەکی کاریگـەریان کـردووە، لەوانـە ئـەم هۆکارانـە بیردەخەینـەوە کـە بیرمەنـدانی هاوچـەرخی عـەرەب هـەوڵیان داوە دەسـتیان بخەنەسەر و لێکیان بدەنەوە، ئەو هۆکارانەی کـە بەرزکەرەوەیـەکی واقعی و بەرجەستەن بۆ زیادبوونی کردەوە تیرۆریستییەکان لە جیهانی عەرەبیدا :

١- هەموو رەگەزەکانی ئەم کۆمەڵگایە بەیەکەوە و بەیەك جۆری پێشکەوتنی هاوتواناوە پێش ناکەون. ئێمە دەبینین کۆمەڵێك ئاست لەم کۆمەڵگایەدا پێشدەکەون و کۆمەڵێك ئاستی دیکەش هەن کە دوادەکەون. هەندێ لایەن هەن پەرەدەسێنن و هەندێ لایەن هەن پاشەکشە دەکەن، هەندێ ئاست هەن بەرزدەبنەوە و هەندێ ئاست هەن نزم دەبنەوە؛ هەندێ رواڵەت و میکانیزم هەن کە ئیش بە گیانی داهێنان دەکەن و هەندێ رواڵەتیش هەن کە ئیش بە ناوەرۆکی وابەستەبوون و شوێن کەوتن دەکەن. هەر لێرەشەوە ئەو ئاژاوەیە بەدمردەکەوێ کە ئێستا لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا دەیبینین و، ئەو کەمتەرخی و زۆر بەکارهێنان و دووبارەبوونەوەیەش کە لە شەقام و قوتابخانە و ماڵ و هونەر و ئەدەب و فکر و شتی تردا دەیبینین. واتە تاقە رێکخەرێك لە کۆمەڵگای عەرەبیدا نییە و، یەك سیستمی ئۆرکسترالیی رێك و گونجاویش نییە لەم کۆمەڵگایەدا. لەم رووەوە، لە کاتێکدا کە ئەدەب لە بواری شیعر و پەخشاندا شێوازگەلێکی داهێنەرانەی هونەریی مۆدێرن وەردەگرێت، دەبینین رەخنەی عەرەبی نکۆڵی لەمە دەکا و بەنکوڵی لێکردن و رەتکردنەوەوە هەڵوێستی لێ وەردەگرێت. لەو دەمەشدا کە تیایدا فکری سیاسی بە شێوەیەکی سنووردار پێشدەکەوێت، دەبینین کە کاری سیاسی لە پاشکەوتندایە و ئیش بە سیستمی خەلافەتی بۆماوەیی و میکانیزمەکانی ئەم خەلافەتە و میراتییە سیاسییە کۆنینەکەی دەکات. لە کاتێکیشدا کە تیایدا فکری عەلمانی و فکری نوێخواز پێشکەوتنێکی زەینیی بەرجەستە بەخۆوە دەبینێ، بەلام لە سەر کاغەز و لە هۆڵەکان و بنکە رۆشنبیرییەکاندا، دەبینین شەقامی عەرەبی بەهەنگاوی فراوان هەنگاو بەرەو فکری ئاینی دەنێت، بەلام تەنها لەسەر ئاستی سرووت و رواڵەتە ئاینییەکان. لە کاتێکیشدا کە تیایدا ئابووریی عەرەب پێشدەکەوێ و ئیش

بـه شـێوازە داراییـە مۆدێرنـەکان دەکـات، دەنگـی دامـەزراوە ئاینییـەکان دەبیـستێن کـە هێشتا بانگەشـە بـۆ شـەڕکردنی سیستمی دارایـی جیهـانی دەکەن و بە قازانجوەرگر و حەرام و لە ئاین دەرچوون ڕەخنەبارانی دەکەن. ئەوە روونە کە مۆدێرنەی عەرەبی بە پلەی یەکەم ئابووریی عەرەب و پاشان ئەدەبی عەرەبیی گرتۆتەوە و، دەرئەنجامەکانیشیان بە روونـی لـە ئـابووریی عەرەبدا دەرکەوتن، چونکە مۆدێرنە بە بیروباوەڕەکان دەستنیشان ناکرێت، بەڵکو لە رێگەی پێگەی ئابووری – کۆمەڵایەتییەوە دەست نیشان دەکرێت، ئەمـەش ئـەو شـتەیە کـە لـە ئینگلتـەرادا روویـدا کاتێـك کـە شۆڕشـگێڕانی ئینگلیز هـەردوو شۆڕشـی ساڵانی ١٦٤٩ و ١٦٨٨یـان بەرپا کرد، ئەو دوو شۆڕشەی کە پایەکانی شۆڕشی ئابوورییان سەقامگیرکرد. بەوەش، هەروەك محەمەد قەساس دەڵێ : کەوتنە پێش بیرمەندە عەقڵانییەکانی ئینگلیزەوە. لـە کاتێکیـشدا کـە تیایـدا ململانێـی نێـوان رەسـەنایەتیو هاوچـەرخێتی لەفکری عـەرەبیی هاوچـەرخدا تونـدتر دەبێت بە جۆرێك کـە ئـەم ململانێیـە بۆتـە گرفتێکـی رۆشـنبیری و فکریـی پـەتی، دەبینـین کـە عـەرەبێکی سـادە هاوچەرخبوون و رەسـەنایەتیی پێکەوە و لەیەك کات و یەك رۆژدا پەیڕەو دەکـا بـەبێ ئەوەی گرانییـەك یـان ئاستەنگێك لەمەدا ببینێت . ئەو بـەیانی دەڕوا بۆ بانك و مامەڵەی قازانخواردووی حەرامکراو دەکاو ((حـەرامکراو لـە نـەریتی سـەلەفییەکان، نیوەڕۆیش دەچێت بـۆ مزگـەوت بـۆ کردنـی نوێـژی نیوەڕۆ، شەویش گوێ لە مۆزیك و گۆرانی دەگرێت کە شتێکی نـەفرەتکراوە بە گـوێرەی قـسە و فیـشاڵی سـەلەفییەکان و، تەماشـای فیلمـی رۆژئـاوایی ناشیرینیش دەکا)) ناشیرین بەپێی نـەریتی بنـەڕەتخوازەکان، پاشان نوێـژی عیشا ئەکا و دەنوێت. لەسەر ئەوە زۆر نموونـەی تـریش لـە ژیـانی رۆژانـەی هاووڵاتیی عەرەبدا ببینەوە کە تیایدا رەسەنایەتی و هاوچەرخبوون بە جۆرێك

وا بە یەکدادەچن دەبێتە مایەی بەرێوەچوونی ژیان نەك ئاستەنگ کردنی، ئەمەش ئەوشتەیە کە عەرەب دەیەوێ چونکە لەمەدا ئەزیان هەیە و ئەزیان لێدان. مرۆڤی عەرەب لە هاوچەخبوون - ی دەوێت کە ژیانی بۆ ئاسان بکا، لە رەسەنایەتیشی گەرەکە کە ژیانی بۆ دابین بکات بەبێ رەچاوکردنی بانگەشەکانی بنەرەتخوازەکان و هاوچەرخەکان و هات و هاوارەکانیان لە دژی ئەم و ئەو. ژیانی واقعیی عەرەب-یش هەنوکە ئەوشتانە لە رەسەنایەتی و هاوچەرخبوون وەردەگرێت کە سوودی پێ بگەیەنێت و واز لەوەش دێنێ کە ئاستەنگی بۆ دروست دەکات. ئەوەیش کە عەرەب لە کەلەپوری خۆیدا نایبینێتەوە – کە زۆرن – لە هاوچەربوون و مۆدێرنەتەدا وەریدەگرێت، ئەوەش بە ناچارکردن و گوێڕایەڵکردن ناکا، بەڵکو بۆ ئەوەی ژیانی خۆی مسۆگەر بکا و بەرێوەچوون و پاشەرۆژی باش بێت و بەردەوامبوونی مسۆگەر بکات. ئەم رێگایەش دەتوانێ یەکێتییەکی ئۆرگانیی لە نێوان هەردوولایەنە پێك ناکۆکەکە بخولقێنێت. لەبەر ئەوە، پێش هەموو شتێ پێویستە پێویستییەکانی سەردەم دیاری بکرێت و داواکارییەکانی بزانرێت و ئەو قۆناغە مێژووییەش کە کۆمەڵگاکانی ئێستا پێیدا تێپەردەبن دەستنیشان بکرێت، چونکە دابین کردنی ئەو خواستانە و پڕکردنەوەی ئەو پێداویستییانە مەرامی بەدی هێنانی رەسەنایەتی و هاوچەرخبوونە( *بڕوانە: حەسەن حەنەفی،* الأصالة و المعاصرة ).. ئەمەش ئەو شتەیە کە ئێستا هەیە، بە تایبەتی کە مرۆڤی عەرەب لە جیهانێکی گۆشەگیر یان دابڕاودا ناژی، بەڵکو لە نێوەندی جیهانێکی مۆدێرندا دەژی و لە رووی بازرگانی و ئابووری و کولتووری و زانستی و سیاسییەوە فراوانترین مامەڵەی لەگەڵدا دەکات. مرۆڤی عەرەب لە دروستکردنی ئەم جیهانەدا هاوبەشە ئیدی چەند هاوبەشێکی دۆڕاوی قازانجکەریش بێت، چونکە ئەو

هیچ شتێکی نییە پێشکەشی ئەم جیهانەی بکات، شت لە جیهان وەردەگرێت و هیچی ناداتێ.

٢- کۆمەڵگای عەرەبی، لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و سیاسییدا هێشتا کۆمەڵگایەکی عەشیرەتگەرا و خێڵەکی و تایەفەگەرە. دەشێت تەواوترین و رووترین نیشانەی گوزارشتکردنیش لە نامەدەنییەتی کۆمەڵگای عەرەبی خودی دیدی مرۆڤی عەرەب بێت بۆ دیموکراسی کە وای دەدەنێت کێشەیەکە و قەیرانێکە و یارییەکە و سوودی نییە نەك وای دابنێت کە کارێکی سیاسیی کردارییە و فکر و هەڵسوکەوتێکە بەتەنها پەیوەندییان بە کایەی سیاسییەوە نییە. بۆیە لێرەشەوە مرۆڤی عەرەب ناتوانێ وەك واقعێك لە دیموکراسیدا بژی و وەکو شەڕێك شەڕ بۆ دیموکراسی بکات ( بڕوانە : سعيد بن سعيد، إشكاليات في الفكر العربي والعلوم الإنسانية، ص١٢) .

٣- لە کۆمەڵگای عەرەبیدا کێشەی دووفاقیشمان لەژیاندا هەیە کە کۆن و نوێ و، رەسەنایەتی و هاوچەرخبوون کێشەیان لەسەری هەیە و، کێشەی هەڵوێستیشمان هەیە لەم دوو فاقییە. ئەم دووفاقییەش لە دەرکەوتە جیاجیاکانی ژیانی عەرەبدا لە رابردوو و ئێستاشدا خۆی نواندووە. حەسەن حەنەفی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە پاشاکانی میسر لە سەروەختی حوکمی پاشایەتیدا کۆشکەکانیان بە شێوازی سەردەمی رابوون (النهضة)ی ئیتاڵی بونیاددەنا و بە شێوازی لویسی پازدەهەم و شازدەهەمیش مۆبیلیزەیان دەکرد و لە هەمان کاتیشدا دژایەتیی رۆژئاوایان دەکرد (*بڕوانە:* ثقافتنا المعاصرة بين الأصالة و التقليد). ئێستا هەمان حاڵ بەشێوەیەکی فراوان لە جیهانی عەرەبیشدا بەدی دەکەین بە تایبەتی دوای ئەوەی کە رۆژئاوا وای لێهات بوو بە بەرهەمهێنەری سەرەکی بۆ شتومەکەکانی بەکاربردن (

الإستهلاك)و میكانیزمەكانی زانین و گەیاندن و پەیوەندییەكان و شتی تریش. رۆژئاوا وەك چێشتی پیسكەكەشی لێهاتووە، ئەخورێ و زەم-یش دەكرێ.

# کۆمەڵگای مەدەنی،
# کلیلی دیموکراسیی تەندروستە

— ١ —

دیموکراسیی کۆمەڵگەیی، یان دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگای مەدەنی، بە مانای پەخشکردنی هەرچی زیاتری گیانی بەرپرسیارێتییە لای تاکەکان لە ئاستی بیرکردنەوە و ئیشکردن لەسەر مافی چارەنووسیان و خۆبەدەستەوە نەدان بۆ دەوڵەت و بگرە بۆ سیاسەتیش بەو پێیەی سیاسەت نێوەندی چڕکردنەوەی بڕیاری کۆمەڵگەیی و یەکخستنێتی، یان بە تاقی تەنها پشتی پێ دەبەسترێ بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکان و پێداویستییە خواستراوەکان. کەواتە قسەکردنی زۆر لەسەر کۆمەڵگای مەدەنی و دامەزراوەکانی لە وڵاتە پیشەسازییەکاندا وەك بەڵگەیەکە لەسەر پێگەیشتنی دیموکراسی یان کامڵبوونی و لەگەڵیدا پێگەیشتنی کۆمەڵگاکان و، بەرزبونەوەی پلەی کارلێك و بەیەکگەیشتنیش لە ناو دەوڵەتدا هەروەك بورهان غەلیون دەڵێ

لەو موحازەرەیەی کە لە کۆڕی " کۆمەڵگای مەدەنی و دیموکراسی " لە ساڵی ٢٠٠١ دا لە بارەی (( سەرهەڵدانی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی و پەرەسەندنی لە چەمکێکی پەتییەوە بۆ سیستمێکی کۆمەڵایەتی و نێودەوڵەتی )) وتییەوە.

## ـ ٢ ـ

ئەوەی تێبینی کراوە و هەروەك زۆربەی کۆمەڵناسانی عەرەبیش وای دەبینن لە سەرەوویانەوە حەلیم بەرەکات، کۆمەڵگای مەدەنیی عەرەبی هێشتا لە قەیرانێکی خنکێنەردا دەژی. دەوڵەتی عەرەبی ( دەوڵەتی سەربەخۆیی ) هەژمونی بەسەر زۆربەی کایەکانی ژیانی عەرەبدا کردووە و هەستاوە بە گەلێ پەراوێز خستووەو سنوری داناوە بۆ دەستپێشخەری و بەشداریکردنی لە پرۆسەی گۆڕاندا، ئەمەش لە ڕێگەی بێ بەشکردنی گەل لە مافە سیاسییەکانی و لە دامەراندنی ئەو ڕێکخراو و دەستە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئابوورییانەی کە یارمەتیی لە ناوەوە ڕا گۆڕانی کۆمەڵگا دەدەن . هەروەها دەوڵەتی عەرەبی دەسەلاتی لە گروپێکی دیاریکراوی خەڵکدا پاوانکردو ڕێیی دەستاودەستکردنی دەسەلاتیشی گرت و لەو پرەنسیپانەی ئیسلامیش لایدا کە بانگەواز بۆ دەستاودەستکردنی دەسەلات دەکەن ( و تلك الأيام نداولها بين الناس / آل عمران ، ١٤٠ ).

نیو سەدەیە ئەو شتە لە جیهانی عەرەبیدا بەرپا بووە کە بە قەیرانی کۆمەڵگەی مەدەنی دەناسرێت، ئەو قەیرانەی کە زۆرێك لە کۆمەڵناسانی عەرەب بۆ هەژمونی ( دەوڵەتی سەربەخۆیی ) ان گێڕایەوە: هەژمونێکی

باوکسالارانە بەسەر چالاکییە سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی و رۆشنبیرییەکانی کۆمەلگادا. لە دروستبوونی دەولەتی سەربەخۆیی عەرەبیش لە سەرەتاکانی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەوە، قەیرانی کۆمەلگەی مەدەنیی عەرەبیش سەریهەلدا، ئەمەش بە دروستبوونی دەولەتی دەسەلاتگەرای عەرەبی بۆ پڕ کردنەوەی ئەو بۆشاییە سیاسییەی کە کۆلۆنیالیزمی بەریتانی و فەرەنسی لە جیهانی عەرەبیدا بەجێیان هێشتبوو. کۆمەلناسانی عەرەب هۆکاری ئەم قەیرانەی کۆمەلگای مەدەنیی عەرەبی لە میانەی قسەی حەلیم بەرەکات، کە یەکێکە لە کۆمەلناسانی هاوچەرخی عەرەب، لە کتێبی ( کۆمەلگای عەرەبی لە سەدەی بیستدا .. لاپەڕە ٩٢٣) بەوە لێکدەدەنەوە کە ئەم قەیرانەی کۆمەلگەی مەدەنیی عەرەبی؛ دەرئەنجامی هەژمونی فەرمانڕەوایی عەرەبە بەسەر کۆمەلگادا، و دەرئەنجامی پەراوێزخستنی گەل و سنووردانانە بۆ دەستپێشخەری و بەشداریکردنی لە پرۆسەی گۆڕاندا و، بێبەشکردنی لە مافە مرۆییە بنەڕەتییەکانی، لەوانە مافی ئیشکردنی بە شێوەیەکی رێکخراو و رێکخستنی میللی لە میانەی دامەزراوەکانی و کۆمەلە پیشەییەکانی و یەکێتییەکانی و سەندیکاکانی و پارتەکانی و رێکخراوەکانی و ئەو بزووتنەوە کۆمەلایەتییە سەربەخۆ جیاجیانەیەوە کە دەتوانرێ لە میانەیانەوە ئیش لەسەر گۆڕینی واقع بکرێت . هەروا بەوەش کە توێژینەوە لە قەیرانی کۆمەلگای مەدەنی توێژینەوەیە لە پیادەکردنی دەسەلات لە دەولەتی زۆرەملێدا. لەم رووەوەشەوە ئاشکرایە دەولەتی عەرەبی کۆمەلگای لە ئەرك و پیشە ژیانییەکانی تالانکردووە و بۆ خودی خۆی پاوانی کردوون.

**- ٢ -**

بایەخـدانمان بـە قـسەکردن لەسـەر کۆمـەڵگای مـەدەنی و پێـداگرتن لەسەری، لەوەوەیە کە دروستبوونی کۆمەڵگەی مەدەنی کلیلی دروستوونی دیموکراسـییەکی تەندوسـت و ، دروسـتبوونی کۆمـەڵگای ئازادییـە دارێـژراوەکان و بڵاوبوونـەوەی مۆدێرنـەی سیاسـی و فکـر و ئـەدەبی و هونەری و ئابوورییە لەو کۆمەڵگەیەی کە کۆمـەڵی مەدەنی تێدایە. هـەروەها دروستبوونی کۆمـەڵگای مـەدەنی بەمانای ئەوەیە کە دەوڵـەتێکی عـەلمانیی بەرقـەرار هەیە کـە ئـاینی لـە سیاسـەت جیاکردۆتـەوە و رێـی لـەوە گرتـووە پیاوانی ئاین کاری سیاسی بکەن و ئەو فتـوا سیاسییانە دەربکەن کە هـیچ بەهایـەکی سیاسـییان نییـە و مـەرام لێیـان دنەدانـە نـەك رەخنـە لـە خـودی سیاسی، هـەر ئەوەشـە کـە لـە دژی دەوەستێن. پیـاوانی ئـاینی ـ ش لێرەدا، وەك عەفیف ئەلئـەخزەر لـە پێشەکییەکەیدا بـۆ وەرگێرانـی کتێبەکـەی لینێن (تێکستگەلێك لەبارەی هەڵوێست وەرگرتن لە ئاین) دابەشیان دەکات، پێنج پلەی بنەرەتین:

١- قازییەکان.

٢- ئیمامـەکان، کـە رۆڵـی ئێزگـەکانی ئـەمرۆیان گێـراوە و دەیگێـرن لـە سازکردنی خۆبەخشینی رەعییەت بۆ خەلیفە و بەستنەوەی وابەستەبوونیان پێوەی بە پلەی باوەڕداری.

٣- فوقـەها، کـە سـەرکردانی دیدوبۆچـوونەکان بـوون و ئاراسـتەکاری بیروبـاوەری خـەڵك و داتاشـەری داوەری و ئیجتهاداتـەکان بـوون بـۆ ئـەو دەسەڵاتدار یان بازرگانانەی پێویستییان پێییەتی.

٤- فەرمووده‌وانان، کە هەندێکی کەمیان نەبێ، ئیشیان ئەوەبوو بۆ پاساودانی حەز و ئارەزووەکانی فەرمانڕەوایان، هەر فەرمووده دابتاشن.

٥- ئامۆژگاریکاران، کە دەچوونە لای خەلیفەکان بۆ ئەوەی ئامۆژگارییان پێ بدەن و هەستکردن بە ئاسوودەیی ویژدان ببەخشنە خۆیان و ئەوانیش، ڕۆڵیشیان لە کاهینەکانی داننان ئەچێ لە مەسیحییەتدا.

هەروەها پیاوانی ئاینی بەردی چێوە ـ ش بوون بۆ دەسەڵاتی ئۆتۆکراتییانەی خەلافەت و بە بێ فتوا و دەسیسەکانی ئەوان خەلیفەکان نەیاندەتوانی بەو ئاسانییە بەرهەڵستکاران بە تۆمەتی لە ئاین دەرچوون پاکتاوبکەن. زۆر بەکەمیش ڕوویداوە خەلیفەیەك بەر لەوەی فتوایەکی سەرزارەکی یان نوسراو-ی یەکێك یان زیاتر لە یەکێك لە زانا بەناوبانگەکان سەردەمەکەی بەدەست بهێنێت، دەست بنێتە بینە قاقای بەرهەڵستکارێکی ئاینی یان سیاسی.

## ـ ٤ ـ

زۆرێك لە بیرمەندانی عەرەب لەسەر گرێدانی نێوان کۆمەڵگای مەدەنی و دروستبوونی دیموکراسی و کۆمەڵگای ئازادییەکان و بڵاوبوونەوەی مۆدێرنەی سیاسی و فکری و ئەدەبی، کۆکن. ساموێل هانتنگتۆن لە کتێبی ( شەپۆلی سێیەمی دیموکراسی)دا دەڵێ: وەرچەرخانی دیموکراسی بە سەرکەوتوویی ڕووینەدەدا ئەگەر ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی نەبووبایە. ئەوە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنین کە پشتگیریی دیموکراسی دەکەن و وای لێدەکەن قابیلی وەستان و هەڵگەڕانەوە نەبێ. لە ناوەڕاستی نەوەدەکانیشدا چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی تەنها سەرنجڕاکێش

و باو نەبوو، بەڵکو لە دەرهاویشتەکانیدا وای لێهات بۆ هەردوو پرۆسەی دیموکراسی و پەرەپێدانی ئابووری و کۆمەڵایەتی، دەوڵەندیش بوو. کۆمەڵگای مەدەنی هەروەك سەعدە دین ئیبراهیم دەڵێ: وای لێهات لە دەوری فەزایەك لە ئازادی دەخولایەوە، فەزایەك کە خەڵکی تیایدا بە ویستی ئازادانەی خۆیان بەیەك دەگەن و، لە پێناوی چەند ئامانجێك یان بەرژەوەندییەك یان گوزارشت کردن لە سۆزی هاوبەش، دەسپێشخەری دەکەن. لە فەزای ژیانی فرەیی و دیموکراسیشدا کۆمەڵگای مەدەنی دەبێتە پشتیوان بۆ دەوڵەت و دەبێتە پێکهاتەیەکی سەرەکیش لە پێکهاتەکانی هێزی دەوڵەت، ئەوەشی لەپەنای دەسەڵاتدا کە چیدی لە هەڵلوشینی دەوڵەت پاشگەز دەبێتەوە بۆ ئەوەی ببێتە دەسەڵاتی یاسا دوای ئەوەی کە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بۆ خۆی یاسای دەسەڵات بوو. ئەمەش لە پێناوی ئەوەی دەوڵەت بگەڕێتەوە بۆ بوارە سروشتییەکەی خۆی، واتە فەزایەکی نیشتمانی بۆ ڕێکخستنی ململانێی ویستە ئازادە سەربەخۆکان و بەڕێوەبردنی بەشێوەیەکی ئاشتییانە، تاوەکو هەوڵ و کۆششیش لەباربێت بۆ ڕاوەستان بەرووی هەڕەشە نەتەوەییە هەنووکەیی و پاشەڕۆژییەکان کە تیایاندا وڵاتانی ئێمە، وەك باقیی وڵاتانی جیهانی سێی دواکەوتوو، لە ئاراستەکردنی پەرەپێدانێکی عەقڵانی و دادپەروەرانەدا کە هەمووان تیایدا بەشداری بکەن، پێویستیی بە ڕۆڵێکی بەهێزتری دەوڵەت هەیە لەلایەك و، لەلایەکی تریشەوە، پێویستیی بە کۆمەڵگایەکی مەدەنیی بەهێزتر هەیە کە ئیش لەسەر بەهێزکردنی پێکەوە لکان و یەکبوونی نیشتمانی بکات .

# هەردوو شێخ و دیالۆگی کەڕەکان

**ـ ١ ـ**

نازانم بۆچی ناوبەناو پیاوانی ئاینی خۆیان بە کێشە سیاسی و ئابوورییە ئاڵۆزەکانەوە قاڵ دەکەن وەك ئەو ململانێیەی کە ئێستا لە نێوان سوننەی عەرەبی عیراق و شیعەی عەرەبی عیراقدا هەیە!.

زۆربەی خەڵك پێیان وابوو ئەو ململانێ خوێناوییەی کە ئێستا لە عیراقدا لە نێوان سوننە و شیعەدا بەڕێوەدەچێ ململانێیەکی مەزهەبییە نەك ملانێیەکی سیاسی و ئابوری بێت و وڵاتانی دەوروبەری عیراق جۆشی بدەن. سەرەتای ململانێکەش هەر لە شەڕی سەففەین ـ ەوە بەرلە ١٤ سەدە، ململانێیەکی مەزهەبی نەبوو لە نێوان معاویە بن ئەبی سوفیان و عەلی بن ئەبی تاڵب ـ دا، ململانێیەکیش نەبوو لەسەر چۆنیەتی لێکدانەوەی قورئانی پیرۆز، یان چۆنیەتی جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامی. ململانێکە کە لەو کاتەوە دەستی پێکرد، ململانێیەکی سیاسی بوو لە نێوان دەوڵەت و

مزگەوتدا و، لە نێوان دەوڵەتی ئاینی و مەدەنیدا، لە نێوان ئەو خولەفایانەی کـە دەیانـەوێ لـە حـوکمی راشـیدییانەدا بـەردەوام بـن و لـە نێـوان ئـەو خولەفایانـەی کـە دەڵـێن: نـە هـەواڵ هـاتووە و نـە سـروش ( الـوحي )یـش دابەزیوە، قورئانی پیرۆزیش لـەبن دەسـتی خۆیانـدا جێبـەجێ دەکـەن و، بـە قورئانیش دەڵێن: ((ئەمە دوا سەردەممانە لەگەڵتدا)) هـەروەك عەبدولمـەلیك بن مـەروان وتبـووی کاتێـك کـە هـەواڵی خەلافـەتی بـۆ هـاتبوو. ململانێکـە ململانێش بـوو لـە نێـوان ئـەو ئیمامانـەی کـە خـەریکی خواپەرستێن و ئـەو خەلیفانەی کە لە سەکۆی نوێژی هەینییەوە دەڵێن: (( وەڵڵاهـی هـەر کامتان پێم بڵێن تەقوای خودا بکە لە ملی دەدەم)) هەروەك عەبدولمەلیك بن مەروان وتبووی.

— ٢ —

ئەو ململانێیە کە ئەمڕۆ لە نێوان سوننە و شیعەدا بەڕێوەدەچێت هـەمان ئـەو ململانێیەیـە کـە لـە نێـوان عـەلی بـن ئـەبی تاڵـب و معاویـە بـن ئـەبی سـوفیان-دا هـەبوو بـەڵام بـەجیاوازی ـ ی کـات و شـوێن و نـاوەڕۆکی کێشەکەوە. ململانێکە ململانێیەکی سیاسییە لە نێوان گروپێك لە عـەرەبی شیعە کە دەیانەوێت سیستمی ئاخوندیی ئێران جێبـەجێ بکـەن، بەڵام نـەك هـەمووی، بـەڵکو بەشـێکی، واتـە باشـوری عـیراق لـە رووی سیاسـییەوە وابەستەی ئێران بێت و لەژێر گرەوی سیاسەتەکانیدا بێ، بۆ نموونە، وەك وابەستەیی ئیسرائیل بۆ ئەمریکا. هـەروەها باشوری عیراق هاوپـەیمانێکی ستراتیژی و سیاسیش بێت بۆ ئێران، بۆ نموونە، وەك هاوپـەیمانی حزبـوڵڵا بـۆ سـوریا و ئێـران، لـە کاتێکـدا کـە سـوننەی عـەرەب لـەم هاوپەیمانێتییـە

دەترسن و ڕەتیدەکەنەوە، ڕەتیدەکەنەوە نەك لە ترسی ئێران بەڵکو لە ترسی خۆیان و مافە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیرییەکانیشیان.

ناکۆکیی نێوان عەرەبی سوننە و عەرەبی شیعە لە عیراقدا ناکۆکی نییە لە نێوان دوو مەزهەبی ئاینیدا. سوننە و شیعە هەردووکیان ئەوە دەزانن کە سەردەمی حوکمی مەزهەبە ئاینییەکان بەسەرچوو. بۆیە ململانێی ئەمڕۆ ململانێیەکی سیاسی و ئابوورییە نەك مەزهەبی ئاینی. لە سەدەکانی یەکەمی زاینیدا و لە سەدەکانی یەکەمی کۆچیدا ئەوەی زاڵ بوو ململانێی مەزهەبیی ئاینی بوو، بەڵام لەگەڵ گۆڕانی نەتەوەکان و کولتوورەکان و هاوکێشە سیاسییەکاندا سروشتی ململانێکەش گۆڕا. ململانێی نێوان ئەمریکا و یەکێتیی شورەوی ململانێیەکی سیاسی نەبوو ئەوەندەی کە ململانێیەکی ئابوری سیاسیی نێوان سەرمایەداری و سۆشیالیزم بوو نەك ململانێی نێوان کاسۆلیکی ڕۆژئاوا و ئەرسۆدۆکسی ڕۆژهەڵات کە هەردووکیان لە یەك ئاینن ڕێك وەك سوننە و شیعەی ئێستا.

— ٢ —

بەڵام شێخ قەرەزاوی و لەگەڵیدا کۆمەڵێك پیاوی ئاینی شتێکی تریان ناوێت تەنها وەرچەرخاندنی ململانێی نێوان سوننە و شیعەی عیراق نەبێت بۆ ململانێیەکی ئاینی مەزهەبی بۆ ئەوەی ببنە لایەنێك لە ململانێکە و سیاسییەکان لە ململانێکە دوور بخەنەوە و قسەیان لەم ململانێیەدا قسەی باڵا بێت. هەر لەبەر ئەوە پێشتر شێخ قەرەزاوی، کە ئێستا بۆتە (( پیاوە پێویستەکەی عیراق )) و چۆتە شوێنی سەدام حسێن–ی (( پیاوە پێویستەکەی پێشوی عیراق))، بانگەوازی بۆ ڕابەرە کوردەکانی کوردستان

کردبوو کە بەر بەخوێنڕشتنی سوننە و شیعە بگرن لە ناوەڕاست و باشووری عێراقدا. وا ئەمڕۆش قەرەزاوی ماشێنە میدیاییە زەبەلاحەکەی خۆی دەجوڵێنێ کە خۆی لە کەناڵی جەزیرەدا دەبینێتەوە بۆ ئەوەی دیالۆگێکی ڕاستەوخۆ و زیندوو لە نێوان خۆی و ڕەفسەنجانی سازبدات بۆ ئەوەی هەروا و بە ( نوکە قەڵەمێك) کۆتایی بەو ململانێیە بهێنێت کە لە نێوان سوننە و شیعەدا هەیە. دیالۆگەکە لە نێوان هەردووکیاندا دروست بوو بەبێ ئەوەی لەم دیالۆگەدا بە دەرئەنجامێك دەربچێن کە لە دیالۆگی کەڕەکان دەچوو. چونکە نە شێخ قەرەزاوی لەوە تێدەگەیشت کە ڕەفسەنجانی دەیوت و نە ڕەفسەنجانیش لەوە تێدەگەیشت کە قەرەزاوی دەیوت. ئەم دیالۆگی کەڕانەش هەر ئەوەی لێ دەرنەچوو، چونکە دیالۆگە لە نێوان ڕێبەری سیاسەتی ئێرانی-ی عەمامەبەسەری داپۆشراو بە توێکڵێکی ئاینی کە خۆی وێنە ڕاستەقینەکەی ئەوەیە کە پیاوێکی ئابووری و پارەدار و بەڵێندەر( مقاول)ـە و گەورەترین بازرگانی فستق-یشە لە جیهاندا و دەوڵەمەندترین کەسیشە لە ئێراندا و ٤٦هەمین پلەشی لە لیستی دەوڵەمەندەکانی جیهاندا داگیرکردووە و، لە نێوان شێخ قەرەزاویدا کە دەوڵەمەندترین پیاوی ئاینیی سوننی-ی هاوچەلاخی ئیسلامە لە جیهاندا و قازیی شەرعیی بیست کۆمپانیای گەورەشە لە جیهانی عەرەبیدا.

— ٤ —

دیالۆگی کەرەکان کە تایبەت بوو بە باردۆخی عیراق لە نێوان هەردووکیاندا بەرپابوو . شێخ قەرەزاوی پرسیاری هۆکارەکانی ئەوەی کرد کە مەرجەعە شیعییەکانی ئێران فتوایەکی روون و راشکاویان دەرنەکردووە کە کوشتنی تایەفەگەرانە حەرام بکا و بەرەنگاربوونەوەی داگیرکاری بکاتە فرمان و ئەرك. قەرەزاوی دەڵێ : (( ئەگەر فتوایەکی روون بە حەرامکردنی گروپەکانی مەرگ لەلایەن مەرجەعەکانی ئێرانەوە دەربکرایە ئەوە کێشەکە کۆتایی دەهات)) .. قەرەزاوی پرسیاری ئەوەش دەکا : (( بۆچی فتوایەك دەرناکرێ بە روونی بەرەنگاری بکاتە ئەرك ؟ )) ..

جا تێبینی بکەن کە قەرەزاوی ئەوە پەسەند دەکا کە فتوایەکی ئاینیی ئێرانیی جادووییانە بەسە بۆ کۆتایی هێنان بە ململانێی سیاسی و ئابووریی نێوان سوننە و شیعەی عەرەبی عیراق !! ئەمە ئەوپەڕی گەوجی و نەزانییە بەرامبەر بە هەقیقەتی ململانێکە.

بە دڵنیاییەوە رەفسەنجانی بە خراپەیی سیاسیی خۆی و تەڵەکەی بازرگانییانەی خۆی، درکی بە ئامانجی پشت ئەم پرسیارە و ئەم دنەدانە کردبوو، بۆیە وەك پیشەی هەمیشەیی بەشێوەزاری پیاوی دەوڵەت توانجی خۆی داپۆشیبوو و وتی: (( دکتۆر قەرەزاوی رادەسپێرم هەواڵەکان و راسپاردەکانی بەرپرسە ئێرانییەکان بخوێنێتەوە، ئەودەم دەزانێ کە مەسەلەکە سەبارەت بە ئێران گۆڕاوە و، دەزانێ کە مەرجەعەکان چەند ئەوەیان سەرکۆنە کردووە و رەتکردۆتەوە کە لە عیراقدا روودەدات)) ..

دیالۆگ لەبارەی هەڵسوکەوتە ئاینییەکانی سوننە و شیعە بەردەوام بوو، هەردوو شیخ نەشیانتوانی دەست بخەنەسەر هۆی راستەقینەی ئەو

ململانیٚ سیاسییەی کە ئێستا لە عیراقدا لە نێوان سوننە و شیعەدا هەیە، چونکە قەرەزاوی مشتومڕەکەی لە ڕوویەکی ئاینیی پەتییەوە وروژاند لە کاتێکدا ڕەفسەنجانی لە ڕوویەکی ئاینی-سیاسیەوە سەیری کرد. هەردوو ئەم شێخە عەقڵیان ئەوەی نەبڕی کە ئەو ململانێیە عەرەبییە سوننەییە شیعییە لە عیراقدا ململانێیەکی سیاسی ئابوورییە و جیاوازییە لەسەر دابەشکردنی سامانی نیشتمانی و دەسەڵاتی سیاسی نەك جیاوازی بێت لەسەر ئەوەی کە عائیشە ( خێزانی پێغەمبەر - وەرگێڕ) یان خەڵکی دی لە یاوەرانی پێغەمبەر، بەرلە چوارده سەدە، چییان کردووە وەك بە تایبەت شێخ قەرەزاوی بۆی دەچیٚ کە بەرگێکی ئاینی و مەزهەبیی پەتیی کردبووە بەری دیالۆگەکە، هەر لێرەشەوە بوو کە دیالۆگەکە سەرکەوتوو نەبوو و بە تاکە ئەنجامێکیش نەرنەچوورین، واتە دیالۆگەکە زیاتر خۆنواندنێکی میدیاییانە بوو تا هەر شتێکی دی.

— ٥ —

وەك چارەسەرێکی جادوییانە بۆ ئەم توندوتیژییە، قەرەزاوی داوای بەکارهێنانی فتوا ئاینییەکانی کرد نەك داوای عەقڵ و واقعییەتی سیاسی و دابەشکردنی دەسەڵات و سامان. لەم ڕووەشەوە داوای لە ڕەفسەنجانی کرد کۆمەڵێك فتوای ئاینیی جادوییانە بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە دەربکات لەوانە: دەرکردنی فتوایەك بۆ حەرامکردنی کوشتار و حەڵاڵکردنی بەرەنگاریکردنی داگیرکاری وەك ئەوەی فتوایەکی لەم جۆرە بتوانیٚ ئەو کوشتارە رابگرێت بە بیٚ پێدانی ئەو مافە سیاسی و ئابوورییانە بە سوننە کە لەسەر شێوەی هاوبەشیکردن لە سامانی نیشتمانی و دەسەڵاتی سیاسی

داوایان دەکەن. سەرەڕای ئەم دیالۆگی کەڕانەش، هەریەك لە فەهمی هوێدی ( بیرمەندێکی ئیسلامیە – وەرگێڕ) و سەلیم عەوا ( سەرۆکی یەکێتیی زانا موسڵمانەکانی جیهانە – وەرگێڕ)، کە هەردووکیان لە موریدەکانی شێخ قەرەزاوی-ن و پەخشکەرەوەی تەپ و دوکەڵی بوخوڕن بە دەوری فتواکانیدا، بە شێوەیەکی ئیجابی توانجی خۆیان لەسەر ئەم دیالۆگەدا..
هوێدی وتی: قەرەزاوی شێوازی بەراشکاوی وتن و بە ئاشکرا وتنی گرتەبەر کە ئەمە لە زانای غیرەتدار ئەوەشێتەوە بەرامبەر بە نەتەوەکەی ( نەتەوە لێرەدا بە مانای اُمة-یە نەك قومیة – وەرگێڕ ) ئەو زانایەی کە دەیەوێت دەست بخاتە سەر برینەکان. هەرچی سەلیم عەوا ـ یە ئەوە ئەویش وتی: ئەم دیالۆگە بە نۆبەرەی ئەو هەنگاوە بونیادنەرانە دادەنرێت کە وەفدێکی ((یەکێتی زانایان )) بە دەستی هێناون لە میانەی وتوێژەکانیدا لەگەڵ بەرپرسە ئێرانییەکان و لە کاتی سەردانەکەیدا بۆ تاران بەر لە دوو هەفتە لەپێناوی کوژاندنەوەی ئاگری فیتنەو گێڕانەوەی سوننی و شیعی بۆ بنەڕەتی برایەتیی ئیسلامییانە.
جا ئەمە قسەیەکە لە هەوادا لەلایەن هەندێ لەدەروێشەکانی تەکێ سۆفی و سیاسییەکانەوە.

# پاشەڕۆژی کۆمەڵگەی مەدەنیی عەرەبی، چییە؟

— ١ —

بــەکارهێنانی زاراوەی کۆمەڵگـــەی مـــەدەنی لـــە ئـــەدەبیاتی زانـــستە کۆمەڵایەتییەکان لە نەوەدەکانی سەدەی بیستدا بڵاوبووەوە، ئەمەش دوای داڕمـــانی وڵاتـــانی بلـــۆکی ڕۆژهـــەڵات، لـــە پێـــشەوەشیانەوە گـــەورەترین و بەهێزترین دەوڵەت کە یەکێتی سۆڤێت خۆی بوو بەبێ ئەوەی لەلایەن بلۆکی دوژمنەوە کە ڕۆژئاوا بوو و لەلایەن باڵە سەربازییەکەیەوە کە بە پەیمانی ناتۆ ناسراوە یەك فیشەکی پێوە بنرێ. لە کاتی خۆیدا وادەوترا کە ئەم داڕمانە خێرایە، بۆ ئەوانەی کە سروشتی ڕژێمە تۆتالیتارەکانیان دەناسی، کە فەرمانڕەوایەتیی وڵاتانی بلۆکی ڕۆژهەڵاتیان دەکرد، شتێکی لەناکاو نەبوو، چونکە لەم ڕژێمە تۆتالیتارییانەدا دەوڵەت کۆمەڵگا و، حزبی تاق و تـــەنهای ئایـــدیۆلۆژی-یـــش دەوڵـــەت قـــووت دەدات و، تـــاك-یـــش لـــە

rووبەڕووبوونەوەی دەوڵەت و حزبدا گۆشەگیر دەبێت و، لەخۆیدا یان لە خێزانە بچکۆلەکەیدا دەمێنێتەوە تاوەکو لە بەرەنگاربوونەوەی قەوارە ساردو سڕە گەورەکانی هەریەك لە دەوڵەت و حزبدا، خۆی لە ئامێزە گەرمەکەیدا بپارێزێت.

— ٢ —

فەرهەنگی ئۆکسفۆردی سیاسی، کۆمەڵگای مەدەنی بە کۆمەڵگای ئەو دامەزراوانە دەناسێنێت کە وابەستەی دەوڵەت نین و خۆشیانی لەگەڵدا گرێ نادەن، هەروەها وابەستەی خێزانێك یان حزبێك یان رێکخراوێك لە رێکخراوەکان نابن. کۆمەڵگەی مەدەنی ئەو کۆمەڵگایەیە کە دامەزراوگەلێکی خۆبەخش و گروپگەلێکی هەرەوەزی دەگرێتە خۆی. زاراوەی "کۆمەڵگای مەدەنی" لە سەدەی هەژدەمەوە لەلایەن نوسەرانی جیاجیاوە بە مانای جیاواز بەکارهاتووە. چەمکی سەرەکیی " کۆمەڵگای مەدەنی"یش وا مایەوە کە هەمیشە بگەڕێتەوە بۆ هیگڵ-ی فەیلەسوفی ئەڵمانی. ئەگەر ئەوەش راست بێت کە مارکس وتوویەتی کەوا " کۆمەڵگای مەدەنی" چەقی ناوەندی و شانۆی مێژووە و پێگەی ژێرخانیش دەنوێنێت، ئەوە کۆمەڵگای مەدەنی چرکەساتێکی ئیجابی و کارایە لە پەرەسەندنی مێژوویدا نەك دەوڵەت وەك لای هیگڵ هاتووە.

## ـ ٢ ـ

سەعدە دین ئیبراهیم کۆمەڵگای مەدەنی بەوە دەناسێنێ کە فەزایەکە بۆ ئازادی، فەزایەك خەڵکی تیایدا بەیەکدەگەن و ئازادانە کارلێك دەکەن و لەپێناوی دۆزی هاوبەشدا، یان بەرژەوەندیی هاوبەش، یان بۆ گوزارشت کردن لە هەست و سۆزی هاوبەش، بە ویستی ئازادانەی خۆیان دەستپێشخەریی بە کۆمەڵ دەکەن، کە دەشیکەن بەشێوەیەکی بێوەی و ئاشتیخوازانە دەیکەن. ئەوەش رەت ناکەنەوە کە خەڵکی دی هەمان شت بکەن. بەم مانایەش، کۆمەڵگای مەدەنی لە بازارێکی گەورە دەچێت کە بەگوێرەی پێویستیی تاکەکانی و بە گوێرەی کالا خواستراوەکان و بە گوێرەی رازیبوون لە نێوان سەوداکاراندا کڕیار و فرۆشیاری تیادا دەگۆڕێ. ئەم گۆڕانەش بە گوێرەی پێویستی و بە گوێرەی بابەت و بە گوێرەی لایەنەکانی سەوداکردن سەقامگیریی مامەڵەکردنەکان لەنێوان خودی لایەنەکاندا رەت ناکاتەوە، سەقامگیریی چەشنەکانی مامەڵە و بنەماکانیشیان رەت ناکاتەوە، بەجۆرێك هەموو جارێ پێویست بە سەرلەنوێ دۆزینەوەیان ناکات، بەڵکو مامەڵەکردنی نوێ دێتە ئاراوە، یان لایەنی نوێ دێنە گۆڕەپانەکەوە.

هەروەها سەعدە دین ئیبراهیم دەڵێت : کۆمەڵگای مەدەنی، کە ئەمڕۆ قسەی لەسەر دەکەین، تەنها چەمکێك نییە ئاماژە بۆ ئاستێك لە ئاستەکانی ئەو چالاکییە کۆگەلییە بکات کە هەڵگری فرەیی و ناودژی ( التناقض ) و بەشەکێتی ( الجزئية ) و بەرژەوەندیی تایبەتییە، بەڵکو ئاماژە بۆ کۆمەڵێك لەو رێکخراوە کارایانە دەکات کە دیاریکردنیان و دەستنیشان کردنی پێگەیان و شوێنیان و ئەو رۆڵە گەورەیەی کە دەیگێڕن، هەندێ جار،

هاوشانی دەوڵەته و، هەندێ جاریش، دژی دەوڵەتە. بەڵام ئەوەی زۆر لەوە گرنگترە ئەوەیە کە، چیدی بەو شێوە لە کۆمەڵگای مەدەنی ناڕوانرێ وەك ئەوەی بەرجەستە کردنی شتی تایبەت و بەرژەوەندییە بەشەکییەکان بێت لە بەرامبەر دەوڵەتی بەرجەستەکار بۆ هەمووان و بۆ بەرژەوەندییە هەمەکییەکان ( المصالح لكلية )، بەڵکو وەك دەوڵەتێکی بەرامبەر بە دەوڵەت لێ دەڕوانرێت، واتە وەك کۆمەڵە ڕێکخراوێك کە هەڵگری قازانجی گشتی و نامانجی هەمەکین و سەرچاوەیەکیش پێك دێنن بۆ یاسا و ڕێساخوازی و عەقڵانییەت و پێگەیاندن و ڕێکوپێکی لە ناو سیستمێکی کۆمەڵایەتیدا کە دەوڵەت زۆرێك لە کایەکانی تاراندووە، یان وای لێهاتووە ناتوانێ یاسا و ڕێسا و ئاشتیان تیادا پەخش بکا.

— ٤ —

ئێمە ئەگەر بەرەو سەردەمی ڕزگاربوون بڕۆین لەو چەمکە کلاکسیکییە تازەیەی دەوڵەت: دەوڵەت وەك مەڵبەندێکی تاکڕەهەند و تاق و تەنها بۆ ڕێکخستن و هاریکاریی کۆمەڵایەتی، کە ئەو سەردەمەش ئەوە دوو سەدە زیاترە بەردەوامە، ئەوە پرسیارەکانی تایبەت بە پاشەڕۆژی کۆمەڵگای عەرەبیش سەرکەوتن بەدەست دەهێنن. ئەو ڕزگاربوونەش لەو چەمکە تەقلیدییەی دەوڵەت، بە زەرورەت، بە مانای نەمانی دەوڵەت نییە، بەڵکو بە مانای نەمانی شێوەیەکە لە شێوەکانی دەوڵەت. بەڵام گرنگتر لەوە ناسینی سروشتی ئەو گروپ و ڕێکخراو و دامەزراوانەیە کە دەچنە شوێنی دەوڵەت و کۆبەندی چالاکیی هەموو سەدەی داهاتوو پێك دەهێنن و ڕەنگە ئەو سەدەیەش کە بەدوایدا دێت. گەڕانەوەی ئێستاش بۆ کۆمەڵگا شەپۆلێکە

ڕەگوڕیشەکەی قوونە، بەڵام ڕێگاکانی ئەو گەڕانەوەیە و شێوەکانی و ئەو نمونانەی کە لێوەی دەکەونەوە، هەموو ئەوانە هێشتا لە سەرەتاکانی یەکەمیدان. پرسیاریش ئەوەیە، وەك بورهان غەلیون دەپرسێ، ئایا گروپەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، یان روونتر بڵێین، بونیادنانی کۆمەڵگەی مەدەنی بەمانای گروپە ئەهلییە کاراکانی بواری کاری گشتی، یارمەتیی دۆزینەوەی کۆمەڵگایەکی ئازادتر و گونجانێکی گەورەتری نێوان ئازادیی تاك و ئازادیی کۆ و، ڕێك و پێکیی زیاتری نێوان بەرپرسیارێتیی فەرمانڕەوا یان بڕیاردەر و نێوان بەپرسیارێتیی فەرمانبەسەرداکراو یان جێبەجێکاردا، دەدات ؟..

## ـ ٥ ـ

لە میانەی سەدەی داهاتوودا بەرەو شێوەیەك لە کۆمەڵگای مەدەنی دەڕۆین کە تیایدا سیاسەت ملکەچ دەبێت، سیاسەت وەك ئەوەی گەڵاڵەکردنێکە بۆ ئەو وێناکردن و هەڵبژاردنانەی ( الإختیارات ) کە پەیوەندییان بە چارەنووسی گشتی و چارەنوسە بەشەکییەکانیشەوە( المصائر الجزئیة) هەیە و وەك ئەوەش کە چەند بڕیارێکە دەخوازێ ئەو هەڵبژاردنانە بۆ کار و چالاکیی کۆمەڵێکی بێ سنوور لە کۆڕ و گروپ و ڕێکخراوە مەدەنییە ناحکومییەکان، جێ بەجێ بکا. حکومەتیش کە ناوەندەکانی بڕیاری ڕەسمیی سیاسیی داگیرکردووە ڕۆڵی شتێکی تری نابێ تەنها هاریکاری نەبێت لە نێوان چالاکیی ئەم گروپ و ڕێکخراوانە و دۆزینەوەی خاڵی هاوبەش لە نێوانیاندا. لەم گۆشەیەشەوە گروپە نوێکانی کۆمەڵگای جیاجیای مەدەنی چوارچێوەیەك پێشکەش دەکەن کە بوار بە هاووڵاتییان

دەدات بــە شــێوەیەکی گــەورەتر و کــاراتر بەشــداری لــە دیــاریکردنی چارەنووسیاندا بکەن و بەشێوەیەکی بەهێزتریش پشکیان لە سیاسەتدا هەبێت بەو پێیەی سیاسەت سەرقاڵبوونە بە چارەنووسی گشتییەوە و پیادەکردنی ئەو بڕیارانەیە کە پەیوەندیی پێوی هەیە. هەر ئەوەش بازنەیەك لە بەشداریی سیاسی دروست دەکات کە هاوشانی ئەو بازنەیەیە کە پەرلەمان دەینوێنێت، ئەو بازنەیەی پەرلەمان کە لەسەر پرۆسەیەکی هەڵبژاردنی سەرژمێرکاریی پەتی راوەستاوە و، هەقیقەتی ئەو ویستە کۆمەڵگەییانە رەنگ نادەنەوە کە هەن و لەسەر پێکهێنانی سیاسەت پێشبڕکێیانە، بگرە لەسەر بازنەیەك کە بازنەی پەرلەمان تێپەڕێنێ و بیخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، ئیتر لەرێگەی فشارەوە بێ، یان لە رێگەی دەستومردانی راستەوخۆوە لە پێك هێنانی رای گشتیدا.

بورهان غەلیون وای دەبینێت کە رێکخراوەکان و گروپەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لە رووی نفوز و هێزەوە زیاد دەکەن بە تایبەتی ئەوانەی کە لەسەر ئاستی جیهانی یان فرە رەگەزەکاندا کاران بە تایبەتی لەو کۆمەڵگایانەدا کە گرموکردنیان لەسەر دەوڵەت دۆڕاندووە و لە بونیادنانی کۆمەڵگایەکی مەدەنیی بەهێزیشدا سەرکەوتوو نەبوونە. ئەمەش دۆخی وڵاتانی عەرەبی و زۆرێك لە وڵاتانی تازە پەرەسەندووە. وەك چۆن دەوڵەت ناتوانێت بەرەنگاری گوشارەکانی ئەو رێکخراوانە ببێتەوە کە لافدانیان زیاد دەکا لەوەی کە بەشداری دەکات لە بڕیاردانی سیاسەتە جیهانییەکاندا، ئاوها کۆمەڵگای داڕوخا و لەبەرهەڵوەشاویش، کە لە ئامێزی نموونەی ئەم دەوڵەتە نا نەتەوەییانەدا سەریهەڵداوە، یا ئەوەتا ناتوانێ خۆی و گروپە چالاکە تایبەتەکانی خۆی بونیاد بنێت، یان توانای ئەوەی نییە لەسەر

خاکی خودی نیشتمانی خۆی بەشداریی کاریگەر لە گروپە مەدەنییە جیهانییە کاراکاندا بکات.

## - ٦ -

بونیادنانەوەی کۆمەڵگا مەدەنییەکان لە پاش ساڵی١٩٩١ و لە دوای دارمانی یەکێتیی سۆڤێت و بلۆکی رۆژهەڵاتەوە، بووەتە پێویستییەکی پێلێداگیراو. یەکێتیی سۆڤێت ئاستەنگێکی سەرەکی بوو بە رووی دامەزراندنی کۆمەڵگا مەدەنییەکان لە وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵاتدا. بەدەر لە کڵێسای کاسۆلۆکی-یش لە پۆڵەندا هیچ روخسارێك لە روخسارەکانی کۆمەڵگا مەدەنییەکان لە ئەورووپای رۆژهەڵاتدا نەبوو.

ئەشتوانین بایەخدانی گەورە بە دامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنی لەم هۆکارانەدا پوخت بکەینەوە:-

١- دارمانی تەواوەتیی دەوڵەتی تۆتالیتاری کە خۆی لە یەکێتیی سۆڤێتدا دەنوێنێت.

٢- بەڕێوەبردنی ململانێ سیاسییەکان لە ناوچە جیاوازەکانی جیهاندا بە شێوەی ئاشیخوازانە و، پەنابردن بۆ چارەسەری ئاشتییانە، یان ئەوەی بە " شۆڕشەکانی ئاوریشم " دەناسرێ.

٣- پەیوەندیی دروستبوونی کۆمەڵگای مەدەنی بە دیموکراسی و ئازادی و پەرەپێدانەوە.

هەرچی لە جیهانی عەرەبییە، ئەوە سەرەڕای ئەو پەرەسەندنە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیرییانەی کە لە جیهانی دەوروبەری عەرەبدا

روویان داوە، هێشتا کۆمەڵگای مەدەنی دروست نەبووە، بگرە رۆشنبیرانی عەرەب ئەوەشیان خستەسەر و هاتن زاراوەی کۆمەڵگای مەدەنییان گەندەڵ کرد و، بە مانا و پەیڕەوکردنگەلێکیان بارگاوی کرد کە هەڵیناگرێ، ئەمە بەئەندازەیەك ئەم زاراوەیە ماناو مەرامی خۆی لەدەستدا.

# هەندێ لە ئاستەنگەکانی بەردەم پێشکەوتنی شارستانیمان

— ١ —

لە سەدەی نۆزدەوە عەرەب لەسەر چییەتی بنەماکانی پێشکەوتنی شارستانییەتی مشتومڕ دەکەن و، هەوڵ دەدەن ڕێگایەکی خێرا و بێوەی بۆ پێشکەوتنی شارستانی بدۆزنەوە. ئەوان جیاوازییەکی توندیشیان هەیە لەوەی ئەو بنەمایانە چین. نازانن لە رابردووەوە یاخود لەو گەلانەی ترەوە وەریان بگرن کە پێشکەوتنی شارستانیی گەورەیان بەدەست هێناوە، یان بە تێکەڵکردنی رەسەنایەتی و هاوچەرخبوون؟

بەڵام محەمەد عابد ئەلجابری لە کتێبی ( رووناکبیری عەرەبی و گرفتی رابوون/رێنیسانس. تێڕوانینێکی ئایندەییانە ) جەخت لەوە دەکا کە ئایندەی پێشکەوتنی شارستانیی عەرەبی و رابوونی عەرەب روونادەن تەنها لەسەر بنەمای رەخنەیەکی عەقڵیی نەبێت، ئەم بنەمایەش لەگەڵ سۆزی نەتەوەییدا ناکۆك نییە، لەگەڵ خەونی ئایدیۆلۆژیشیدا ناکۆك نییە، بەڵکو بە

پێچەوانەوە، چاوگێڕانەوە بە چەمکە رابوونییەکانمان و، رەخنەگرتنێکی عەقڵانییانە لێیان کە پشت بە واقع ببەستێ وەك ئەوەی هەیە، تاقە رێگایە کە دەمانبا بۆ بونیادنانی خەونێکی ئایدیۆلۆژیی هاوجووت و: بۆ کاری شێلگیرانەی بەردەوام لە پێناوی بەدیهێنانیدا.

## ـ ٢ ـ

دواکەوتنی کاروانی پێشکەوتنی شارستانیی عەرەبی کە لە سەدەی نۆزدەوە دەستی پێکرد و، خاو وخلیچکەییەکەشی تا ئەو رادەیەی کە لەکۆتایی سەدەی بیستدا دەیبینین بەبێ ئەوەی پرۆژەی رابوون بێتەدی ئەمە سەرەڕای تێپەڕبوونی سەدەونیوێك بەسەر دەستپێکردنیدا، پێدەچێ هەموو ئەوانە پاڵیان نابێ بە هەندێ لە بیرمەندانەوە هاوارێکی سۆزدارانەی بەرز بکەن و، رۆشنبیرانیش بانگەشە بکەن بۆ رووبەڕووبوونەوەی فکریی کراوە لەگەڵ ئەو لایەنەی کە خۆی لە نەخشەکانی پێشکەوتنی شارستانی دوور دەگرێت. وادیارە کە بۆشایی ئارامگرتنی رۆشنبیرانیش لە هەندێ لە رژێمەکانی حوکمڕانی لەجیهانی عەرەبیداو لەستەمکارییان و خراپە و گەندەڵییان وای لێکردوون کە هاوارێك بکەن و بڵێن: رووبەڕووبوونەوەی فکرییانەی کراوە، واتە بەردەوامبوون لەسەر داواکردنی چاکسازی یان پشوونەدان یان نەحەسانەوە، لەسەر دەرکەوتووەکانی ناو رۆشنبیرانی نیشتمانی عەرەبی بۆتە کارێکی پێویست. سوودیشی نییە لە هەموو ئەوەی کە لە دەوروبەرماندا روودەدات کەسانی نێگەتیڤ و غافڵ بین وەك ئەوەی نەبینین و نەبیسین و نەخوێنینەوە. نادر فەرجانی -ی بیرمەندی میسری و سەرنوسەری ( راپۆرتی پەرەپێدانی مرۆیی)ی بەنێوبانگ کە لەلایەن نەتەوە

یەکگرتووەکانەوە دەرچووە، لە توێژینەوەیدا لەسەر پەیوەندیی رۆشنبیر بە دەوڵەتەوە، دوپاتی دەکاتەوە کە (( دەبێ ئیش لەسەر سەرلەنوێ چاندنی چەمکی قوربانی بکەین)) قوربانی بە کۆشش و بە پارە لە پێناوی کارێکی فکریی لە نێوان رۆشنبیرانی عەرەبدا کە لە رووی کۆمەڵایەتییەوە پابەندبێت، ئەوەش وەك رێچکەیەکی نوێ لە رێچکەکانی پێشکەوتنی شارستانیی عەرەبی لە پاشەرۆژدا.

— ٢ —

وەلد ئەباە – ی توێژەر – یش لە ( قەیرانی رۆشنگەری لە پرۆژەی رۆشنبیریی عەرەبیی هاوچەرخدا ) دەڵێ: پێشکەوتنی شارستانی بۆ هەر نەتەوەیەك لە نەتەوەکان لەسەر چوار بنەما بەندە، ئەوانیش:-

١- عەقڵانییەت، کە خود ( الذات ) وەك سەرچاوەی زانین دەبینێ و، ئامانجیشی جەختکردنەوەیە لەسەر دەستگرتنی مرۆڤ بەسەر سروشتدا و، لە تەکنیکیشدا دیدێك بۆ بوون ( الوجود ) دەبینێت.

٢- مێژووگەرایی ( التاریخانیة )، کە ئەمەش وەستانی مۆدێرنەیە لەسەر ماقوڵێتیی وەرچەرخان ( معقولیة التحول ) و ملدانی پەرەپێدانە بۆ پێوەرەکانی پێشکەوتن.

٣- ئازادی، ئازادی وەك زەمینەیەك کە رەوایەتیی دەسەڵات دادەمەزرێنێ و، ماف مرۆڤ لە بڕیاردان لە کاروباری مەدەنیی خۆی، دوپات دەکاتەوە.

٤- تێکەڵ نەکردنی ئاین و سیاسەت، چونکە ئاین پیرۆزگەراییە و، سیاسەت ناپاکییە.

له میانەی ماوەی سەدە و نیوێکیشدا" لە سەدەی نۆزدەوە تا ئەمڕۆ، هیچ شتێ لەم چوار بنەمایە نەهاتۆتە دی ئەمە لە کاتێکدا کە پاشەڕۆژی عەرەب بوارێکی بەرین و فراوانە بۆ بەدی هێنانی ئەم بنەمایانە کە پێشکەوتنی شارستانییانەی عەرەبیان لەسەر دەوەستێت.

لە سەدەی نۆزدەوە تا دەگاتە نیوەی یەکەمی سەدەی بیست، چاوگێڕانەوە بە کەلەپوردا رووی نەداوە و بەڕێوەنەچووە و بە شێوەیەکی میتۆدی و زانستییش لێک جیانەکراوەتەوە. ئەوەیش کە کراوە لەلایەن ئەوانەی کە لەو ماوەیەدا کەلەپووریان تاوتوێ کردووە هێرشکردن بووە بۆ سەر کەلەپور، ئەمەش لە بەرژەوەندیی مۆدێرنە و فکری لیبراڵیدا. بەڵام لە نیوەی دووەمی سەدەی بیست کۆمەڵە میتۆدێکی زانستیی پەتیمان بۆ لێکۆڵینەوە لە کەلەپور بۆ دەردەکەوێت لەسەر شێوەی ئەوەی کە لە رۆژئاوا خوێندنەوەمان بۆ کردن بەبێ لایەنگیریکردن بۆ بیرێکی دیاریکراو یان پێوەندگرتن لە ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراوی پێشوەختەوە.

— ٤ —

لەم رووەوە، محەمەد ئارگۆن – وەک نموونە– و میتۆدەکانی لە شیتاڵکردن و لەرزاندن و لێکدانەوە، هەروەها جەلال ئەلعەزم و، عەزیز ئەلعەزمە و، نەسر حامد ئەبو زەید و، سەید ئەلقەمنی و خەڵکی تریش، بەڵگەیەکی باشن لەسەر دەستپێکردنی مامەڵەیەکی زانستییانە لەگەڵ کەلەپوردا و خستنەرووی مەودای گونجانی ئەم کەلەپورە لەگەڵ پێدراوەکانی ژیانی زانستیی ئەمڕۆدا، یان هەوڵی تێپەڕاندنی ئەم کەلەپورەو پێدراوەکانی لە جێبەجێکردنی ژیانی زانستیی ئەمڕۆدا هەروەک

ئەمە لەگەڵ عەلی عەبدولرازق و تەها حسێن و بە شێوەیەکی بەشەکیش لەگەڵ خالد محەمەد خالد و خەڵکی تردا بەڕێوەچوو. لەبەر ئەوە، ئەو قسەیەی مەتاع سەفەدی لە کتێبی( رابوونی غەدرلێکراو لە گوتاری عەرەبیدا ) کە دەڵێ: شۆکی رابوونی عەرەبی تا ئێستا نەیتوانیوە رووبەڕووی سیستمی بەڵگەنەویستەکان ببێتەوە کە لە رەگ و ریشەی سیمای مێژوویی پرۆژەی رۆشنبیریی عەرەبیدا هەیە.. قسەیەکی، تارادەیەکی دیاریکراو، راستە، بەڵام بە تێبینیی ئەوەی کە نیوەی دووەمی سەدەی بیست وا خەریکە رووبەڕووبوونەوەگەلێك بۆ ئەو بەڵگەنەویستانە بە خۆوە دەبینێ کە لە رەگ و ریشەی سیمای مێژوویی پرۆژەی رۆشنبیریی عەرەبیدا هەن. دەشێ زیادبوونی ئەو رووبەڕووبوونەوانەش لە پاشەڕۆژدا و لە سەدەی بیست و یەکدا، پرۆژەی رابوونی عەرەبی سەرلەنوێ بخاتەوە سەر رێگای تەندروست و رێڕەوی راست.

— ٥ —

پاشەڕۆژی پێشکەوتنی شارستانیی عەرەب گرێدراوە بەوەی تا چەند قۆناغی رابوون تێپەڕ دەکەین و لەم دەورانەوە دەچینەوە دەورانێکی نوێوە بەتایبەتی کە ئێمە نزیکەی سەدە و نیوێکمان لەم دەورانە بەسەبرد بەبێ ئەوەی تا ئێستا بتوانین لەم دەورانە بچینە دەرێ. لەم رووەوە، ئێمە لەو سەردەمەوە، سەردەمی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیست، هەتا ئێستا هەر لە سەردەمی رابووندا دەژین. دەرچوونیشمان بۆ نییە و لەم بوارەدا هیچ دەرگایەك نییە لەبەردەمماندا بکرێتەوە تەنها بنیادنانی فکری رەخنەیی زانستی نەبێت. لەم بارەیەشەوە تارق زیادە لە کتێبی( عەرەب و

فکری رەخنەیی)دا دەڵێ: ئەگەر عەرەب ویستیان بە کردەوە لەم قەیرانە دەربچن ئەوە ئامرازێتریان لەبەردەمدا نییە فکری رەخنەیی نەبێت کە لە شیتاڵکردنی ستراکتۆری خۆیاندا و شیکردنەوەیدا کاری پێ بکەن و، لە ناواخنەکەشیدا بەبێ ترس یان مەترسی خاڵەکانی لاوازی و فشەڵی و کەموکورتی بپشکنن، ئەگینا لەوەی تیایدا هەن هەر دەگەوزێنەوە و بگرە حاڵیان خراپتر دەبێت وەك ئەوەی شەکەتی و لەناوچوونی خۆیان بخوازن.

ئەمەش بەهەر حاڵ بە مانای ئەوە نییە لە سەردەمی رابووندا فکری رەخنەییمان نەبووە، ئەم فکرەمان هەبووە، بەڵام فکرێکی رواڵەتی بووە و، لە رووبەڕووبوونەوەی قوڵ و ئازادانەی ئاستەنگە مەعریفی و واقعییەکانیشدا کەمتەرخەم بووە، ئەوەش لە ئەنجامی ترس و چەپاندن ودەسەڵاتگەری و داپڵۆسین و کۆت و بەند.

# ئێران، بە نرخێکی کەم حەماس دەکڕێ

هەروەك راگەیەنرا لە کاتی سەردانەکەی ئەم دواییانەی ئیسماعیل هەنییەدا بۆ تاران کە چوار رۆژی خایاند، لەم رۆژانەدا ئێران پرۆتۆکۆلێکی سیاسیی قەزانجکەری لەگەڵ گەلی فەلەستیندا گرێدا، بەوەی بزووتنەوەی حەماس ـ ی بە بڕێکی کەمی پارە کڕی کە بریتییە لە چارەکە ملیارێك دۆلار.

ئاژانسەکانیش دەڵێن ئێران، لەو بڕە پارەیە، بۆ ماوەی شەش مانگ موچەی وانەبێژانی ( المدرسین ) فەلەستین دەدات کە ژمارەیان دەگاتە سەد هەزار وانەبێژ. هەروەها بۆ ماوەی شەش مانگیش قەرەبووی سێ هەزار راوچیی فەلەستین دەکات و ئەودوای پارەکەش بەسەر هێزەکانی ئاسایشی گشتیی سەربە حەماس و، بەسەر لایەنگران و حزبییەکانی حەماس و خەڵکی تردا دابەشدەکرێت لەوانەی کە داویانەتە پاڵ ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێ: زەوی و خاك لە دەریاوە بۆ روبار و بە پێچەوانەوە رزگاربکرێت.

## سەرگەورە تازەکانی سیاسەت

ئێران توانی بە پارەی، هەروەك حەسەن نەسروڵڵا وای ناو دەنێ، حەڵاڵ و زەڵاڵ و شەرەفمەندو پاکی خۆی، حەماس و، لەگەڵیشیدا، بە شێوەیەکی تایبەتی، شەقامی غەززەیانەی فەلەستین، بکڕێ. هەروەك چۆن پێشتریش باشووری لوبنان و بەشێك لە شەقامی مەسیحی و دورزی و سوننی و، ئەرمەنی لوبنانیی کە هاوپەیمانن لەگەڵ حزبوڵڵای لوبنانیدا، کڕی.

ئێرانییەکان سەرگەورەی چنینی فەرش-یشن لە جیهاندا. هەرئەوانیش عەرەبیان فێری سیاسەت و هونەر و گۆرانی و دانایی کرد. کەلەپورێکی گەورە و دێرینیشیان لە هەموو ئەو شتانەدا هەیە. زۆربەی زانا موسڵمانەکان و زمانەوانەکانیان و ئەو فەرمانڕەوا و فەیلەسوفە موسڵمانانەش کە دەرکەوتن هەر لە فارسەکان بوون. بۆیە ئێستا فارسەکان، بەو مێژووە دوورودرێژە و، بەو کەلەپورە دێرینەیە و، بەو پارە زۆر و زەوەندە و، بەو پێشکەوتنە زانستییەی کە بە پێشکەوتنی ئەتۆمییانەی حاڵی حازریان بەدەستیان هێناوە، وەها خۆیان دادەنێن کە لە خەڵکی دی زیاتر شایەنی ئەوەن ئەوەی لە جیهانی عەرەبی ماوەتەوە بە میراتی وەرگرن. لەم رووەوە، جیهانی عەرەبی، لەو دەمەوەی کە عوسمانییەکان لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا ١٩١٨ بۆ هاوپەیمانانیان بە جێهێشت و، لەو کاتەوەی کە فەرەنسا و پاشان بەریتانیا ١٩٧٠ لەو دەرچوونەی دوایی لە کەنداو، بەجێی هێشت، بە بێ میراتگر مایەوە. شای پێشووی ئێران هەوڵیدا کە ببێتە میراتگری، بەڵام لەو ئاستەدا نەبوو میراتگرێکی بەهێزبێت. بەوەش جیهانی عەرەبی بە هەتیوکەوتوویی مایەوە تا ئەو دەمەی ئەمریکا لە دەرگا عێراقییەکەوە ٢٠٠٣ لێوەی چووە ژوورێ، بەڵام دیارە ئێران لە بۆسەدا بوو

بۆی. ئێران لە جیهانی عەرەبیدا بە هۆی سوریا و حزبوڵلا و ئەوانەی کە لەگەڵ حزبوڵلادا هاوپەیمانن لە لوبنان، ڕەسید-یشی زۆر گەورەتر بوو لە رەسیدی سیاسیی ئەمریکا کە خاوەنی هیچ نییە جگە لەو دەستەبژێرە سیاسییە عێراقییەی کە بە درێژایی سێ ساڵی رابردوو لە مەمکە گەرم و گوڕەکانەوە شیر دەخۆن و وان لە ئامێزی شیربەخشی ئەمریکادا و، بە دزین و بە تالانبردنی موڵکی گشتی و گەندەڵیی سیاسی و کارگێڕی، دەحەسێنەوە.

## میراتگری نوێی جیهانی عەرەبی

کەواتە، ئەوە ئێستا ئێرانییەکانن کە میراتگرانی جیهانی عەرەبین و شایستەن بەوەی کە لە جیهانی عەرەبی بەجێماوە، ئەو جیهانە هەتیوەی کە بە دوای یەکێکدا دەگەڕێت سەرکردایەیی بکا بەبێ رەچاوکردنی ئەو لایەنەی سەرکردایەتیی دەکات. جیهانێکی لە ڕێدەرچوو و لە دەستدەرچوو. ئەو جیهانەی کە ئەمریکییەکان سێ ساڵە هەوڵدەدەن بە پرەنسیپەکانی دیموکراسی و ئازادی و لابردنی حوکمڕانە ستەمکارەکان سەرکردایەتیی بکەن. بەڵام دیارە جیهانی عەرەبی سەرکردایەتی ناکرێ تەنها بە پەتی ئاین و داری ئاین نەبێت، ئێرانیش ئێستا خاوەنی ئەم دارەیە. ئەم دارەش توانی بە شێوەیەکی زۆر زیرەکانە لە سەختترین قەڵای جیهاندا کە لوبنانە سەرکەوتووبێت، لوبنانێك کە دیموکراسیی رۆژئاوایی تیادا زاڵە و، ١٨ تایەفەی ململانێکاری تێدایە و، لە دەوڵەتانی عەرەبیدا لە هەمووی زیاتر عەلمانیترە و خاوەن کولتورێکی رۆژئاواییە و دوورە لە دەوڵەتی ئاینییەوە.

ئەوەتا ئێران لەوەدا سەرکەوت کە میشێل عوْن-ی مەسیحی و تەلاڵ ئەرسەلان - ی دورزی و سلێمان فەرەنجیە-ی عەرەبگەرا و پارتی بەعسی لوبنانی و پارتی سوریای کۆمەڵایەتیی عەلمانی و ئەرمەنە مەسیحییەکان بکاتە هاوپەیمان و لایەنگری خۆی لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئاخوندیی ئاینی بە سەرکردایەتیی حەسەن نەسروڵڵا هەروەك پێشتریش نەعیم قاسم-ی جێگری حەسەن نەسروڵڵا لەکتێبەکەیدا رایگەیاندبوو، کتێبی ( حزبوڵلا: ئەزموون و چارەنووس و پاشەڕۆژ ).. ( بۆمبی ئەتۆمیش کە ئێران زیاتر لە نیوەی رێگای لێبڕیوە، لە میسۆلۆژیای شیعەدا شتێکی دی نییە تەنها وەك ئەو مەهدی مونتەزیرە نەبێت کە سەرزەمین: سەرزەمینی موسڵمانان و لە ناویدا جیهانی عەرەبی، پڕ دەکا لە داد و چاکە و تێروپڕی و چەوری و هەنگوین) هەر ئەو بۆمبەشە کە وادەکات ئێران ببێتە میراتگری ئەو جیهانە عەرەبییەی کە: دوای ئەوەی میراتگرە دێرینەکانی لە عوسمانییەکان و رۆژئاواییەکان بەجێیان هێشت، بە درێژایی ٣٥ ساڵ بێ میراتگر، یان بێ بەرێخەر، یان بێ سەرکردایەتی. ماوەتەوە.

## چۆن حەماس هەڵبژاردنی داهاتووی مسۆگەر کرد ؟

ئایا تۆزێ دوورکەوتووینەتەوە لە پرۆتۆکۆلی ئێران -حەماس کە بەر لە چەند رۆژێك کرا؟

بە دڵنیاییەوە نەخێر. چونکە قسەی پێشوومان لەسەر ناوەڕۆکی ئەو پرۆتۆکۆلەیە، ئەمە ئەگەر ئەوەمان زانیبێ کە قسەی پێشوومان دەیویست هێز و توانا و دەسەڵاتی کریار بەسەر فرۆشیاری گوێڕایەڵەوە دەربخات. دەشڵێین گوێڕایەڵ، چونکە حەماس بە گوتارە سیاسییەکەی و گوتارە ئاینییەکەی و گوتارە کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەکەی، هەرگیز لە پێدراو و

باوەڕپێهێنراوەکانی ئاخوندیی ئێرانی دەرناچێت، بەڵکو ئەو لە ناوەڕۆکی ئەو پێدراو و باوەڕپێهێنراوانەیە. حەماس، وەك لەم ڕۆژانەشدا ئەو پرۆتۆکۆلە ڕاگەیەنرا، بە چارەکە ملیارێك دۆلار فەلەستین و گەلی فەلەستینی بە ئەحمەدی نەژاد نەفرۆشتووە، بەڵکو تەنها لای دادنووسێکی ئێرانی موسادەقەی لەسەر پرۆتۆکۆلێك کردووە کە خۆی لە مێژە هەبووە و پێدانی پارەکە دواکەوتبوو. بەمەش، حەماس، هەڵبژاردنی فەلەستین-ی بۆ ئەنجوومەنی یاسادانان یان سەرۆکایەتیی داهاتوو مسۆگەرکرد کاتێك کە دێت و بە پارەی ئێران نانی ئەو کۆمەڵە خەڵکە برسی و ڕەش و ڕووت و پێ خاوسە دەدات. واتە حەماس ئەمجارە لە میانەی گەدەی فەلەستینییەوە هەڵبژاردن ڕادەماڵێ نەك لە میانەی عەقڵی فەلەستینییەوە وەك لە ئایاری ڕابردووی ساڵی ٢٠٠٦دا ڕوویدا، چونکە برسییەکان هەر خۆیانن کە جارێکی دی حەماس بەرزدەکەنەوە بۆ گرتنەدەستی حوکمڕانی. ئەوان زۆرینەی گەلی فەلەستینیشن و ڕەشوڕووتەکانیانن، بە تایبەتی کاتێك کە سبەی ئێران گەدەی خاڵییان لە خواردن و گیرفانی بەتاڵیان لە دۆلار پڕ دەکات.

بەوەش هاوپەیمانی فلسان : ( فەلەستین – سوریا – ئیران) توانی، تا ئێستا، بە شێوەیەکی ڕامێنەر بیباتەوە و حزبوڵلا و حەماس و هەموو ئەو هێزانەی ناوچەکەشی لەگەڵدا بێت کە هەوڵی شکست هێنان دەدەن بە(هێزەکانی خراپە) لە جیهاندا، ئەو هێزانەی کە خۆیان لە یەکێتی ئەورووپا و ئەمریکادا دەنوێنێ، دەی پیرۆزیان بێت ! .

# عیراقی نوێ و
# جیهانی عەرەبی و نەتەوەی کورد

بیرمەندی و نوسەری گەورەی عەرەب

د. شاکر ئەلنابلوسی:

* " فەتحکردنی مەککە" شکستی بە هەموو هێزەکانی سەرکەوتکردن و زۆرداریی لە دوورگەی عەرەبیدا هێنا " فەتحکردنی بەغدا"ش پێشەکییەکە بۆ شکستی هەموو هێزەکانی سەرکوتکردن و زۆرداری لە جیهانی عەرەبیدا

* تەماشا بکەن کورد چ باجێکی گەورە و گرانیان دا لە شاڵاوەکانی ئەنفال و شاڵاوەکانی تری کوشتن و وێران کردن بۆ ئازادی و سەربەخۆیی خۆیان!

کەم خوێنەر هەیە لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا ناوی د. شاکر ئەلنابلوسی نەبیستبێت. ئەو بەردەوام یەکێکە لەو قەڵەمە رەخنەیی و بیرمەندە لیبراڵە دیارانەی جیهانی عەرەبی کە وتار و لێکۆڵینەوە و کتێبەکانی تەرخانن بۆ دەربڕینی وشەکان بۆ دنیای شتەکان، بەلام بە ئازادانەترین زمان؛ ئەمە تا ئەو رادەیەی مرۆڤ، هەندێ جار، بە پێچەوانەی تێزی هەندێ لە بیرمەندانی پۆست مۆدێرن، پێت وابێ زمان کۆیلەی فکری نابلوسی ـ یە، نا بەڵکو تەواو لەژێر ویستیدایە.

نابلوسی تا ئێستا پتر لە ٥٠ کتێبی بەنرخی لە بواری ئەدەب و سیاسەت و فکردا هەیە، گرنگترینیان لە جیهانی عەرەبیدا کە چەندین جار چاپکراونەتەوە، ئەمانەن: بۆچی؟ پرسیارەکانی عەرەب لە سەرەتای هەزارەی سێیەمدا (٢٠٠٦)، پارێزەری ئەهریمەن، لیکۆڵینەوەیەك لە بیری عەفیف ئەلئەخزەر (٢٠٠٥)، گۆشە رووگیرکەرەکان لە سیاسەت و رۆشنبیریدا ( ٢٠٠٤)،چوونە سەرەوەی کۆمەڵگای سەربازی عەرەبی لە وڵاتی میسر و وڵاتی شام ( ٢٠٠٣ )، ئەگەر ئیسلام دەرنەکەوتایە، ئێستا حاڵی عەرەب چۆن دەبوو؟ ( ٢٠٠٣)، بیری عەرەبی لە سەدەی بیستدا (٢٠٠١)... جگە لەمانە، کتێبی تری گرنگی زۆرە، بەلام پێوەر، لای ئەو، بەرهەمەکانی نین لە رووی چەندایەتییەوە، بەڵکو ئاستی چۆنایەتی نوسینە.

کوردستانی نوێ دوای گۆڕینەوەی چەند نامە گۆڕینەوەیەك لەگەڵ نابلوسیدا بیرۆکەی گفتوگۆیەکی لەگەڵدا هێنایە بەرهەم. تەوەرەکانی گفتوگۆکەش لە هێڵە گشتییەکەیاندا تایبەتن بە عیراقی نوێ و جیهانی عەرەبی و نەتەوەی کورد، بەلام لە وردەکاریدا تەرخانن بۆ چەند تەوەرێك.

* هەزاران خوێنەری کورد هەن کە لە دۆزەکانی عیراقدا چاویان لەسەر بیروڕای تۆیە، ئەم چاودێرییەش وەك لە میانەی پرسیارکردنەوە لە

ئیلهام لە ئەزموونی کوردی عیراقەوە وەربگرێ. تەماشای ئەو جیاوازییە بکەن کە لە نێوان کەسایەتیی جەلال تاڵەبانی ( حەفیدی سەلاحەدینی ئەیوبی) و سەدام حوسێن یان بەشار ئەلئەسەد یان معەمەر ئەلقەزافی یان عەلی عەبدوڵلا ئەلسالح یان ئەوانی تردا هەیە و ئیدی لەوێوە دەزانن کە بۆچی عەرەب هێشتا گرەو لەسەر کۆیلایەتی و ستەمکاری و دیکتاتۆری دەکات.

## فیدراڵی

* بیرۆکەیەک، بەڵکو بانگەشەیەکی گەورە لە ناوەندە سیاسی و میللییەکاندا هەیە لە عیراق بۆ رێکخستنی وڵات لە ڕووی کارگێڕی و سیاسیەوە و لە میانەی جێ بە جێ کردنی بیرۆکەی فیدراڵی و سیستمی فیدراڵی لە وڵاتدا. با یەکەم جار ئەوەش بیر بخەینەوە کە کورد ئێستا نیمچە سەربەخۆییەکی خۆی هەیە و ناوچەی فیدراڵیی خۆی هەیە کە لە ڕووی ئاسایش و ئارامی و گەشەکردن و بوژاندنەوەوە لە هەموو ناوچەکانی تری عیراق باشترە. ئێستا شیعە-ش داوای دامەزراندنی هەرێمێکی فیدراڵی دەکات لە باشووردا کە ٨ پارێزگای عیراقی بگرێتە خۆی وەک چاولێکەرییەک لەوەی لە هەرێمی کوردستاندا هەیە. هەیە دەڵێ : ئەم بیرۆکەیە تاقە بیرۆکەیە بۆ مسۆگەرکردنی یەکبوونی عیراق و رێگایەکی راست و دروستیشە بۆ بەدی هێنانی هەر پرۆژەیەکی دیموکراتی کە رۆڵەکانی گەلی عیراق لێی رازی بن، بەڵام ئێستا کێشەکە لە هەڵوێستی چەند هێزێکی سیاسیی عیراقدایە کە هێز و جەماوەریبوون و نفوزێکی سنورداریان هەیە و وا لاف دەدەن کە نوێنەرایەتیی سوننەی عیراق دەکەن و هەموو بیرکردنەوەیەک لە بیرۆکەی فیدراڵی رەت دەکەنەوە. ئەو نوسینەشتم

خوێندۆتـەوە کـە لـەبارەی ئەمـەوە تیایـدا دەڵێـت: هەڵویـستی سـوننە لـە فیدراڵی مایەی لێتێگەیشتن نییە و جێی سەرسوڕمانیشە کە تەواوی عیراق بـە کـوردەوە شـیعەیەوە، بـە عـەرەب و جولەکەیـەوە، بـە مەسـیحی و موسڵمانیەوە، لە چاوەڕوانیی بەرەکەتی عەرەبی سوننە، لەسەر یەك پێ رابوەستن تاوەکو عیراق بە جۆشەوە بە رێگایـەکی نوێـدا بڕوات. ئەوەشت وتبوو کە فیدراڵی لە تێگەیشتن و هۆشیاریی عەرەبە سوننە عیراقییەکانـدا جێی نابێتـەوە، باشـە ئەگـەر حالْ ئاوهـابێ، ئایـا چـۆن دەتـوانین بڕوانینـە دواڕۆژی ئەم بابەتە، ئایا رێگاکـانی قەناعـەت کـردن بـە سـوننە چییە؟ یـان ئاقیبەتەکانی ڕەتکردنەوەی بەردەوامی بۆ ئەم بیرۆکەیە چییە و لە بنەڕەتدا لاری بـوونی سـوننە لـەم پرسـە چ ڕەوایەتییـەکی هەیـە و چـۆن دەتـوانرێ سەودای لەگەڵدا بکرێ؟

_ عـەرەبی سـوننە بـە درێـژایی مێـژوو رانـەهاتوون کـە بـژین تـەنها لـە ژێـر سێبەری خەلافەتی ئیمپراتۆرییدا نـەبێ. لەو گۆڕانکارییـە سیاسییانەش بـە ئاگا نین کە بەسەر نەتەوە و گەلاندا هاتووە. هـەتا ئێستاش عـەرەبی سـوننە خەو بە گەڕانەوەی خەلافەتەوە دەبینن. ئەوان هێشتا بۆ روخـانی خەلافـەتی عوسمـانی-یـش بـە شمشێری ئەتاتورکی عەلمانیی سـاڵی ١٩٢٤ دەگـرین. لەبەر ئەوە، عەرەبی سوننە گرێیەکی سایکۆلۆژی و مێژوویی و کولتووریيان هەیـە کـە (( گرێـی خەلافەتـە )) ئـەو خەلافەتـەی کـە توانیـان لـە میانـەی فـەرمانڕەوایی و قۆزتنـەوە و داگیرکردنـی گـەلانی تـرەوە بـەدیی بهێـنن کـە دوایینیـان لـە باشووری ئیسپانیا ( ئەنـدەلوس)دا بـوو کـە بـۆ مـاوەی حـەوت سـەدە داگیریـان کـرد و هـەتا ئێـستاش بـۆ ئـەو سـەرزەمینە داگیرکراوانـە دەگرین ئەمە لە کاتێکدا بریتانیای مەزن فرمێسکی خۆی ڕاگرت و چیدی بـۆ شـوێنە کۆلۆنیالکراوەکـانی خـۆی لـە جیهـانی عـەرەبی و لـە هینـد و لـە

ئەفریقیا ناگری. هەر لەبەر ئەوە، دەستبەرداربوون لە بیرۆکەی خەلافەتی ئیمپراتۆرییانە و پەنا بردن بۆ فیدرالی ئاسان نییە . فیدرالی فۆرم و سیستمێکی سیاسیی مۆدێرن و شارستانییە و تائێستا عەرەبی سوننە لە ئاستیدا نین. هێشتا نەگەیشتوونەتە ئاستی سیاسیی فیدرالیی سویسرا، یان ئاستی سیاسیی فیدرالیی ئەلمانیا، یان ئاستی سیاسیی فیدرالیی ئەمریکا، بەڵکو ئەوان تا ئێستاش دەیانەوێت دەوڵەتی موعاویە بن سوفیان بێتەدی، یان ئەبو جەعفەر ئەلمەنسور ـ ی ئیمپراتۆر و، دەوڵەتی جەمال عەبدولناسر ـ ی ناسیۆنالیستی و دەوڵەتی حافزئەسەد ـ ی بەعسی. بۆیە تاقە رێگایەك بۆ ئەوەی قەناعەت بە عەرەب بکرێ بە فیدرالی نموونەی پوختی ئێستای کوردە لە باکوری عیراق. رێگە ـ ش بدەن عەرەبی سوننە سەردانی باکوری عیراق بکەن بۆ ئەوەی ئێستا ببینن چۆن نموونەی فیدرالیی کوردیی شارستان و پێشکەتنخواز دامەزراوە، بەلام پێم وایە عەرەبی سوننە هەر پێویستییان بە کاتێکی دوورودرێژ دەبێت بۆ ئەوەی لە دێومەزمەی خەلافەتی ئیمپراتۆرییەتی عەرەبیی ئیسلامی رزگاریان بێت ئەمە لە دەمێکدا کە چیدی مێژووی نوێ جێگایەکی نییە بۆ ئەم جۆرە ئیمپراتۆرییەتانە.

## ئەنفال و هەڵەبجە

* جگە لە بیرمەندی عیراقی (هادی عەلەوی) و کۆمەڵناسی عیراقیی بەناوبانگ ( د. فالح عەبدولجەبار) و توێژەری گەورە ( کەنعان مەکییە) و ژمارەیەکی دی لە رۆشنبیرانی راستەقینەی عەرەب، هیچ بابەتێك یان وتارێك یان لێکۆڵینەوەیەك یان کتێبێکم نەخوێندۆتەوە کە رۆشنبیر-ی عەرەب تەرخانی کردبێت بۆ قسە کردن لەسەر ئەو کارەساتە مرۆیی و

مەرگەساتانەی کە گەلی کورد دوچاریان بوو وەك ئەوەی کە لەو وتارەی تۆدا خوێندمەوە کە ناونیشانەکەی ( یادەوەریی کونبووی عەرەب) بوو. رۆشنبیری عەرەب بایەخی بە مەینەتی و چەوسانەوە و بێدادییەکانی کورد نەداوە کە لە عیراقدا چەشتوویەتی، بێباکیش مایەوە لەوەی کە گەلی کورد توشی بوو، ئەو گەلەی کە رایەڵی مێژوویی عەرەبی و ئیسلامی بە گەلی عەرەبەوەی گرێ دەدات، واتە رایەڵی کولتووری و شارستانی. چی وای لێکردی لەسەر هەڵەبجە و ئەنفال بنووسی، بۆ یەکەم جار چۆن لەبارەی ئەم کارەساتانەوە شتت بیست و چیت لەبارەیانەوە خوێندۆتەوە و چۆنت وەرگرت و هەست و سۆزت چی بوو کاتێك کە ئاشنابووی بە پرۆسەگەلێکی بەربەریی هەمەجی کە دەرهەق بە کورد ئەنجامدراون، ئەو گەلەی کە بە زۆرینە موسڵمانە بێ ئەوەی جیهانی ئیسلامی هیچ هەڵوێستێکی لە ئاستیدا و لە ئاست مەینەتی و کارەساتەکانی وەربگرێت؟

ـ وەك رۆشنبیرێکی ئۆرگانیی عەرەب کە دەبێ راستییەکان بزانێ و قسەی راستیی تەواو بکا، لەسەر هەڵەبجە و ئەنفالم نوسی. ئەمە بەبێ رەچاوکردنی خاوەنی ئەم راستییە و ئەوەیش کە سوود لەم راستییە دەبینێ ئیدی موسڵمان بێت یان نا موسڵمان، عەرەب بێت یان ناعەرەب. لەم رووەوە من کە دەنوسم لە پێودانگی راستییەوەیە نەك لە پێودانگی ئاینەکەم و عەرەبایەتیم و نیشتمانپەروەریم و شەرەفی میللەتەکەم و شکۆ و کەرامەتی نەتەوەکەم . هەر ئەمەشە جیاوازیی نێوان من و نێوان ئەوانەی کە لەگەڵمدان لە نوسەرە لیبراڵەکان و گروپەکانی دی. نوسەری لیبراڵ ئەو نوسەرەیە کە جگە لە راستی پەیوەندیی بە هیچ ئایدیۆلۆژیایەکەوە یان نەتەوەیەکەوە یان ئاینێکەوە نییە. نوسەری لیبراڵ نوسەری راستییە ئیدی ئەو راستییە هەرچییەك بێ ، لای عەرەب بێ یان لای عەجەم، لای رۆژهەلات بێ یان

ڕۆژئاوا، لای کورد بێ یان لای ئاشوورییان، لای جولەکە بێ یان لای بوزییەکان، لای موسڵمان بێ یان لای مەسیحی، لای باوکی بێ یان لای دایکی. نوسەری لیبراڵ لە قسەکانی و ووتەکانیدا سیاسی نییە و بێت و شتەکان هەڵسوڕێنێ و بەلایاندا بڕوا و بیانشارێتەوە. لاریبێتەوە لە راستی وەك چۆن سیاسییەکان لاردەبنەوە و، ئەملاوئەولا بکا وەك ئەملاوئەولاکردنی سیاسییەکان و، قسە دەمامك بکا و بە توێژاڵێك هەنگوینیی پیرۆز بیبارێنێ. نوسەری لیبراڵ لە جیهانی عەرەبیدا دژی تەوژمی گشتییە، دژی زۆرینەیە. لە وتنی قسەی هەقدا لەسەر هەر کەسێ بێ زمان درێژە، پارێزەری ئەمریمەنە، رەشکەری لەش و جەستەیە، بە پاداشت یان چاکە نانوسێ، لە دواجاریشدا ئەو، واتە نوسەری لیبراڵ، نەفرەت لێکراوە، نابوتە، رەتکراوەیە، لە خەڵك و لە دەسەڵاتیشەوە غەزەب لێگیراوە و لە بەلارێداچووانیش ئامین*.

هەرچی هەڵوێستی موسڵمانانە لە کارەساتەکانی کورد، ئەوە موسڵمانان هەڵوێستیان نییە تەنها هەڵوێست وەرگرتنیان نەبێت لە وێنەیەکی کارکاتێری یان دەرهێنەرێکی هۆڵەندی یان قسەیەکی راگوزاریی پاپا. هەرچی هەڵوێستیانە لە کارەساتەکانی ئەوانەی لە ئاینەوە برایانن ئەوە هەڵوێستێکی ئابووبەرانە و هەڵوێستگەلێکی سیاسییانەشە زیاتر لەوەی ئاینییانە بێت چونکە موسڵمانان هیچ هەڵوێستێکی ئاینییانەیان نییە و هەموو هەڵوێستەکانیشیان هەڵوێستی سیاسین. عەرەب بەزەیی و دادپەروەری و بەها بەرزە ئەخلاقی و ئیسلامییەکانیش نازانن. عەرەب هیچ لە ئیسلام نازانن تەنها سوجدە بردن و چەمانەوە و ڕۆژووگرتن و

---

* مەبەستی نوسەر لێرەدا ئەوەیە کە نوسەرانی لیبراڵ لە جیهانی عەرەبیدا بەو شێوە ترسناکە تەماشا دەکرێن کە ئەو لای خۆیەوە بەوپەڕی بێزارییەوە باسی دەکات. ( عەدالەت ).

حەجکردن و لەبەرچاو ونکردنی ئاین و TNT ڕێژکردنی ئۆتۆمبێلەکان و کوشتنی بێگوناهـان و هەوڵدان نەبێت بۆ گەیشتن بە حۆری ئەلعەینی بەهەشتی بەڵێن پێدراو نەبێت. ڕۆشنبیریی عەرەبی ١٤ سەدەیە و تا ئێستاش ڕۆشنبیریی وەڵامی ئامادەیە بێ پرسیارکردن. کۆمەڵە وەڵامێکی بەلاش و کۆن و حازربەدەست و ئامادە، بەڵام وەڵامدانەوە بۆ پرسیارەکانی سەردەم بوونی نییە. لێرەشەوە بوو کە ناونیشانی کتێبەکەم وا دانا: بۆچی؟ ئەمەش پشتڕاستکردنەوەی وتەزایەکی نیتچەیە کە دەڵێ: ئەوەی کە دەیەوێ ئاسوودە بێت ئەوە با باوەڕ بکا، ئەوەیش کە دەیەوێ گفتوگۆکاری ڕاستی بێ ئەوە با پرسیاربکا ) .

# بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری (ی. ن. ک)

## ساڵی (٢٠٠٨ ـ ٢٠٠٩)

| ژ | ناوی بڵاوکراوە | ناوی نوسەر | ساڵی دەرچوون |
|---|---|---|---|
| ٢٥١. | هەرێمی کوردستان و تورکیا | مامۆستا جەعفەر | ٢٠٠٨ |
| ٢٥٢. | پارتی سۆسیال دیموکراتی سویدی | عوسمان حەمە رەشید گۆرون | ٢٠٠٨ |
| ٢٥٣. | جلال الطالباني رجل القرار | حوار مع الفضائية العراقية | ٢٠٠٨ |
| ٢٥٤. | لەکیبە هاردییەوە بۆ گۆردن براون | سلێمان عەبدوڵڵا یونس | ٢٠٠٨ |
| ٢٥٥. | دەسەڵاتی دادوەری | گۆران ئازاد حەمە گەمان | ٢٠٠٨ |
| ٢٥٦. | جەنگی دەرونی | ئاراس فەریق زەینەل | ٢٠٠٨ |
| ٢٥٧. | كركوك بموجب احصاء عام ١٩٥٧ | قسم البحوث واستطلاعات الرأي | ٢٠٠٨ |
| ٢٥٨. | مام جەلال جێگری سەرۆکی سۆسیالیست ئینتەرناسیۆناڵ (ی. ن. ئ) ئەندامی هەمیشەیی | مەکتەبی بیرهۆشیاری | ٢٠٠٨ |
| ٢٥٩. | گۆڤاری نوێبوون ـ ١٣ ـ | | ٢٠٠٨ |
| ٢٦٠. | پرۆژەی ئاشتی بەگژداچوونەوەی گەندەڵی | کارسێن بابەکر | ٢٠٠٨ |
| ٢٦١. | دەروازەیەك بۆ پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان | د. ئەنوەر محەمەد فەرەج | ٢٠٠٨ |
| ٢٦٢. | كردستان والسياسة السوفيتية في الشرق الأوسط | تأليف: فاضل رسول<br>ترجمة: غسان نعسان | ٢٠٠٨ |
| ٢٦٣. | ئاشنابوون بەسۆسیال دیموکراتی | کارزان کارسێن | ٢٠٠٨ |
| ٢٦٤. | جیهانێکی دادپەروەر شیاوە | کارزان کارسێن | ٢٠٠٨ |
| ٢٦٥. | لیبەرساڵرێتی و خۆشگوزەرانی هاوبەش | کارزان کارسێن | ٢٠٠٨ |
| ٢٦٦. | بێ بەپێی مێژوو بەرەو بەهەشت | کارسێن بابەکر | ٢٠٠٨ |
| ٢٦٧. | كردستان والحقوق القومية للتركمان | د. مكرم الطالباني | ٢٠٠٨ |
| ٢٦٨. | تەیرانەکانی دیموکراسی | رالف دارن دۆرف<br>و. لەئەڵمانییەوە: ئیسماعیل محەمەدئەمین | ٢٠٠٨ |
| ٢٦٩. | قضية إبادة الأرمن امام المحكمة أو قضية طلعت باشا | ترجمة: غسان نعسان<br>مراجعة: ماموستا جعفر | ٢٠٠٨ |
| ٢٧٠. | ئیرلەندای باکوور | سلێمان عەبدوڵڵا یونس | ٢٠٠٨ |
| ٢٧١. | ناوچەکانی ململانێ لەنێوان کوردو حکومەتەکانی عێراقدا | هەورامان کەمال میرزا عەبدوڵڵا<br>تاریق رەئوف محەمەد | ٢٠٠٨ |

| ٢٧٢. | نوروز عيد الأمجاد ومفخرة الأحفاد | د. احمد عبدالعزيز محمود | ٢٠٠٨ |
|---|---|---|---|
| ٢٧٣. | الكرد في تجارب الأمم وتعاقب الهمم | د. احمد عبدالعزيز محمود | ٢٠٠٨ |
| ٢٧٤. | نیچەو مەسیحیەت | و: لەفارسییەوە: مەسعود بلبایی | ٢٠٠٨ |
| ٢٧٥. | میژووی قەدەغەکردنی کتێب لەکتێبخانەی گشتیی کەرکوکدا | حەمەدیان | ٢٠٠٨ |
| ٢٧٦. | هلمیتی یا کوکولك کیف ابکیلك | محمد شوان | ٢٠٠٨ |
| ٢٧٧. | چوار رۆژ لەکوردستانی ئازاددا | موکەرەم تاڵەبانی | ٢٠٠٨ |
| ٢٧٨. | مسألة إبادة الأرمن امام المحكمة ـ الطبعة الثانية | ترجمة: غسان نعسان<br>مراجعة: ماموستا جعفر | ٢٠٠٨ |
| ٢٧٩. | پرۆژە یاساکانی بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی | حەکۆ ئەسعەد ئەدهەم | ٢٠٠٨ |
| ٢٨٠. | یەکگرتووی ئیسلامی لەنێوان ئیسلامیبوون و نەتەوەییبووندا | بەختیار عبدالرحمن | ٢٠٠٨ |
| ٢٨١. | پیسبوونی بیستن و کاریگەری لەسەر رەفتاری کۆمەڵایەتی | هەوراز محەمەد | ٢٠٠٨ |
| ٢٨٢. | شارەزووری لورستانی باکوور | د. حسام الدین نەقشبەندی | ٢٠٠٨ |
| ٢٨٣. | خانی ـ شاعیرو بیرمەند، فەیلەسوف و سۆفی | پرۆفیسۆر. د. عیززەدین مستەفا رەسوڵ | ٢٠٠٨ |
| ٢٨٤. | زاراوەکانی کۆنفرانس | نەجاتی عەبدوڵڵا | ٢٠٠٩ |
| ٢٨٥. | دەرکەوتنی رێکخراوی قاعیدە لەکوردستانی عێراقدا | یوسف گۆران | ٢٠٠٩ |
| ٢٨٦. | سیاسەتی شیعەکان دەرهەق بەکەرکوک و فیدراڵی | ئارام رەفعەت | ٢٠٠٩ |
| ٢٨٧. | مشكلة تقييد السلطة السياسية بالقانون | زانا رؤوف حەکریم | ٢٠٠٩ |
| ٢٨٨. | یاسای پاریزگا رێکنەخراوەکان لەهەرێمێکدا | و. خەلیل عەبدوڵڵا | ٢٠٠٩ |
| ٢٨٩. | سجالات عربية كردية | د. هەڵکەوت حکیم | ٢٠٠٩ |
| ٢٩٠. | ئیدارەی کوردی ئاستەنگەو ئاسۆی گەشەکردن | مامۆستا جەعفەر | ٢٠٠٩ |
| ٢٩١. | سۆسیال دیموکراسی (میژوو، تیۆری، رەخنە) | د. ئەکرەمی میهرداد | ٢٠٠٩ |
| ٢٩٢. | بیر ـ ئاواز ـ زمان | فرهاد عەبدولرەحمان | ٢٠٠٩ |
| ٢٩٣. | مدينة إله القمر | تأليف: تمارا . إم. غرين<br>ترجمة: عبدالرزاق محمود القيسي | ٢٠٠٩ |
| ٢٩٤. | ئەستێرەی سوور ـ بەشی یەکەم | بوار نورەدین | ٢٠٠٩ |
| ٢٩٥. | ئەستێرەی سوور ـ بەشی دووەم | بوار نورەدین | ٢٠٠٩ |

ناوەندە رۆشنبیری و میدیاییە کوردی و عیراقییەکانەوە بە گشتی تێبینم کردووە لەوەوە نایەت کە تۆ تەنها نوسەر یان بیرمەندێکی ناسراوی و پێویستە خوێنەری جدی بۆت بگەڕێتەوە بۆ ئاشنا بوون بەو بیرو راو گۆشەنیگایانەی کە لەبارەی مەسەلەی عیراق و کوردەوە یان ئەو دۆزانەی ترەوە هەتە کە لەسەریان دەنوسی، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ چاکیی بیرکردنەوەی رەخنەیی لیبرالییانەت کە پێوەی دەناسرێیت و لە زۆر لەو رۆشنبیرانەی تری عەرەبت جیا دەکاتەوە کە لە زیاتر لە بۆنەیەکدا زۆربەیانت بە کوڕی ئەوت ( ئەوانەی سەدام لەپارەی نەوتی عیراق پارەی بۆ بڕیبوونەوە) یان هەڵوێست لاوازەکان لە ئاست دۆزە مرۆیی و عەرەبی و ئیسلامییەکاندا ناوبردووە ..هەروەها لەبەر ئەوەی تۆ ئێستا و لە میانەی ئەزموونی نووسینی خۆتەوە لەگەڵ دۆزی عیراقدا، لای خوێنەرانی خۆت، ئەم مۆرکە و ئەم وێنەیەت پێشکەش کردووە، ئەوە بە باشی ئەزانین لەبارەی ناوەڕۆکی کتێبە تازەکەت پرسیارت لێ بکەین کە ناونیشانی ( بومەلەرزە، پەرەگرافگەلێك لەسەر رەوشی عیراق )ە و کۆمەڵێك لەو وتارانەتی لە خۆ گرتوون کە تەرخانت کردوون بۆ قسە کردن لەسەر دۆخی عیراقی .ئایا لەم کتێبەدا دەتەوێ چی بڵێی و ئامانج و پەیامت چییە ؟ لایەنی بانگ کراو تیایدا کێیە و لەم کتێبەدا چی لە خوێنەر و وەرگرەکانت چاوەڕێ دەکەیت بە تایبەتی کە ئەم کتێبە هێشتا بە شێوەیەکی فراوان نەگەشتۆتە دەستی خوێنەری کوردی و عیراقی؟

. ( بومەلەرزە، پەرەگرافێك لەسەر رەوشی عیراق ) کەلە لەگەڵ رۆژنامەی ( المدى ) و ( الإتحاد)دا بە چەندایەتییەکی زۆر لە عیراقدا دابەش کرا و بەڵکو بەم دواییانە بیستومە کە بە چەندایەتییەکی زۆر لە کتێبخانە

عیرقییەکاندا لەبەری دەگێڕنەوە و دەفرۆشرێنەوە، کۆمەڵێك وتارە کە لە بەرە بەیانی ٩ی نیسانی ساڵی ٢٠٠٣ەوە تا نزیکەی ساڵێك لەمەوبەر نوسیومن، بەڵام ئەم کتێبە ئەو وتارە ( بۆمب)ەی نەگرتووەتە خۆی کە ڕۆژی کەوتنی سەدام حسێن ( بتە گەورەکە ) ٢٠٠٣/٤/٩ بڵاوکراوەتەوە و تیایدا وتوومە: ئایا چاوی هیچ یەکێ لە عەرەبە سەرکوتکراوەکان، ئاوارەکان، دوورخراوەکان، ڕاوەدونراوەکان و، زیندانیکراوەکان باوەڕی بەوە کرد کە بینی بتەکانی دیکتاتۆر لە بەغدا ، بەسرە ، نەجەف، کەربەلا، یەك لە دوای یەك دەڕمێن؟ ئایا بە عەقڵەوە ئەچێ یەکەمین دیکتاتۆری عەرەب لە مێژوودا بەو شێوەیە لەناو بدرێ وەك چۆن پێشتر دیکتاتۆرییەت لە ئەڵمانیا و یەکێتی سۆڤێت و ڕۆمانیا و کۆسۆڤۆ لەنێو درا؟ ئایا بە عەقڵیشەوە ئەچێت کە قەدەر چیدی چاوەڕوان نابێت مەرگی سروشتی، گیانی دیکتاتۆرەکانی عەرەب بکێشێت بۆ ئەوەی نەتەوە لەناویان بەرێت و وای لێ بێ زلهێزیان بۆ بنێرێ بۆ ئەوەی لەناویان ببات؟ ئایا دیمەنی ڕمانی بتەکانی یەکی تاقانە و، سەرکردەی خۆڕاگر و، سەرۆکی دەگمەن و، ڕابەری مەزن و، وێژەوانی پوختە و، شکۆبەخشی (مهیب ) سەرسوڕمێن و فرعەونی ڕافیدەین دیمەنەکانی کەوتنی بتەکانی هیتلەر و مۆسۆلینی و لینین و چاوچیسکۆ و میلۆزۆڤیتچ-تان وەبیرناخاتەوە کە یەك دوای یەك لە ناوچەی جیاجیای ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و یەکێتی سۆڤێت و ڕۆمانیا و کۆسۆڤۆدا دادەڕمان و بەردەبوونەوە؟

بەڵێ ئا ئەوەیە کۆتایی حەتمیی دیکتاتۆریی زاڵم و بەدکار لە هەموو کات و شوێنێکدا چەند کاتیش درێژەبکێشێ! داڕمان و کەوتنی بتەکانی دیکتاتۆر لە عیراقدا دیاردەیەکی عەرەبیی ئەوتۆیە پێشتر شتی وا ڕووی نەداوە، نە لە ڕابردوو و نە لە ئێستاشدا. بە باشی-ش لەم دیاردەیە ڕابمێنن

کە مێژوویەکی نوێ لە ناوچەکە و لە تۆماری عەرەبدا دەنوسێت. ئێمە بە ئومێدی ئەوەوە بووین کە ئەم روخان و کەوتنە بەدەستی گەلی عیراق بێت نەك بە دەستی سەربازەکانی هاوپەیمانان، بەڵام گەلی عیراقی گۆشەگیرکراو ئەو کارەی پێ ناکرێ و لە دۆخێکی نا لەباردایە و خاوەنی هیچی خۆ نییە بە تایبەت لەسایەی سەرکوتکەرێکدا کەدڵرەقترین و هیچ وپوچترین و درندەترین سەرکوتکەرە و لە هەمووشی زیاتر پارێزەری خۆی و رژێمەکەیەتی لە میانەی ئەو دەزگا چەکدارانەی کە ئێمە لە رابردوودا هەر بە بیستن شتمان لە بارەوە بیستبوون و قەبارە و درندەییانمان لەسەر زەمینی واقعدا نەبینیبوو تەنها لە میانەی (( فەتحکردنی بەغدا))دا نەبێت.

بەڵێ گەلی عیراق لەبەردەم سەرکوتکەریی فرعەوندا فرت و فێڵی نەبوو، چ فرت و فێڵێکیشی هەیە لەبەرامبەر ئەم بەد-ی و دڵرەقی و وەحشەتکەرییە و ئەم میلیشیاتەی کە لە ژمارە نایەن لە سەربازی بەکرێگیراو کە دیکتاتۆر و دیکتاتۆریەتیان بە چەشنی نازی و نازییەت دەپاراست ؟ ویستی خواوەند ئەوەبوو کە، بە هەر یەکێ بیەوێ، بڵێت : برۆنە سەر فرعەون کە بۆتە سەرکوتکەر، هەر ئەویش نەتەوەکەی بەلارێدا بردووە و خۆیشی هیدایەتی وەرنەگرتووە، هەر ئەویش بەسەر زەویدا لوتبەرزی دەکا و خەڵکەکەی پارچە پارچە کردووە و، هەر ئەویش بانگی نەتەوەکەی کرد و ووتی ( ئەی نەتەوە ئەرێ موڵکی عیراق هی من نییە ) ویستی خواوەندیش ئەوە بوو کە ئەبابیلی ئاسمان وگڕی زەوی بنێرێتە سەر فرعەون و سەربازەکانی تا لە ناویان ببات. کەوابوو دەبا باوەڕ بە دانایی و ویستی ئاسمان بکەین..!

دامەزراندنی بتەکانی دیکتاتۆری ( مەبەستی لە پەیکەرەکانێتی : وەرگێڕ) لە عیراقدا سەدان هەزاری لە شەهیدانی جەنگی یەکەم و دووەمی کەنداو و لە هەڵەبجە و لە موسڵ و بەسرە و بەغدا و هەموو ناوچەکانی

عیراق تێچوو. دامەزراندنی بتەکانی دیکتاتۆری لە عیراقدا ملیارەها لەو دۆلارانەی تێچوو کە فرعەونی رافیدەین ( مەبەستی سەدامە: وەرگێڕ) لە رێی شەیتاندا ( نەك لە رێی خوا : وەرگێڕ) لە جەنگەکانیدا لەگەڵ عەرەب و موسڵماناندا کردە باجی دانانی بتەکانی دیکتاتۆری. دامەزراندنی بتەکانی دیکتاتۆری لە عیراقدا سەدان ملیۆنیشی بۆ بونیادنانی کۆشکەکانی فرعەون–ی شێتبووی مەزنایەتی تێچوو، ئەو کۆشکانەی کە لە شاشەکانی تەلەفزیۆنەوە بینیمانن لە کاتێکدا گەلی عیراق بە تایبەتی لە باشووردا لە برسێتی و تینوێتیدا دەمرن وەك هەر لە شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە بینیمان. دامەزراندنی بتەکانی دیکتاتۆری لە عیراقدا سەدان ملیۆنیشی بۆ دروستکردنی حەشارگەکانی ژێر زەوی تێچوو، ئەو حەشارگانەی کە بۆ پاراستنی فرعەون و خەڵکەکەی خۆی و هاوەڵەکانی دروستی کردبوون هەروەك ئەندازیاری ئەڵمانی کارل ئایزەر باسی کردبوو کە بەشداریی لە بونیادنانی ئەو حەشارگانەدا کردبوو و خۆی لە کۆمپانیای بەڵێندەرایەتیی ئەڵمانی Knauer & Boswau ئیش دەکات کە لە ساڵی ١٩٨٤دا بە تێچووی ٦٠ ملیۆن دۆلار ! هەستابوو بە جێبەجێکردنی دروستکردنی ئەو حەشارگانە. دەی ئایا پرۆسەی روخاندنی بتەکانی رژێم چەندی تێچوو ؟

دیمەنی جوان و خۆشیی کەوتنی بتەکانی دیکتاتۆر لە عیراقدا جوانی و گەورەیی و خۆشیی هیچ شتێك هاوشانی نییە تەنها کەوتنی بتەکانی سەردەمی نەزانیی عەرەب ( الجاهلية) لە مەککە و " فەتحکردنی مەککە" نەبێت ! ئایا " فەتحکردنی بەغدا" " فەتحکردنی کردنی مەککە" تان بەبیر ناهێنێتەوە؟ ئایا کەوتنی بتەکانی دیکتاتۆری لە شەقامەکانی بەسرە و نەجەف و کەربەلا و بەغدا دا کەوتنی بتەکانی جاهلییەتتان لە کەعبە دوای " فەتحکردکردنی مەککە" بە روونی، بەبیر ناخاتەوە؟ ئایا هەست بەوە

ناکەن کە لە دوای " فەتحکردنی بەغدا" وە دەرئەنجامگەلێکی گەورە دێنە کایەوە کە لە گرنگییاندا لە سەرئەنجامەکانی " فەتحکردنی مەککە" کەمتر نین؟

" فەتحکردنی مەککە" لە دواییدا هەموو بتەکانی عەرەبی لە دوورگەی عەرەبیدا خست، " فەتحکردنی بەغدا"ش لە دواییدا هەموو ئەو بتانەی عەرەب کە لە جیهانی عەرەبیدا ماون، دەخات.

" فەتحکردنی مەککە" شکستی بە هەموو هێزەکانی سەرکوتکردن و زۆرداریی دوورگەی عەرەبی هێنا، " فەتحکردنی بەغدا"ش پێشەکییەکە بۆ شکستی هەموو هێزەکانی سەرکوتکردن و زۆرداری لە جیهانی عەرەبیدا. " فەتحکردنی مەککە" لەگەڵ خۆیدا رۆشنایی ئازادیی بۆ عەرەب و کۆی جیهان هێنا، " فەتحکردنی بەغدا"ش پێشەکییەکە بۆ ئازادیی هەموو جیهانی عەرەبی و دەبێتە نموونەیەکی تریش لە نموونەکانی ئازادی لە جیهاندا.

" فەتحکردنی مەککە" موژدەیەکی گەورەی هاتنی قۆناغێکی روناککەرەوە و جوان-ی لە پێشداهاتوو بوو لە ئاسمانەوە بۆ عەرەب و بۆ جیهان، قۆناغێک کە ئاشتی باڵی بەسەر مرۆڤدا دەکێشێ، " فەتحکردنی بەغدا"ش موژدەی دووەمە لە ئاسمانەوە. ئەگەر ویستی ئاسمان نەبووایە " فەتحکردنی مەککە" رووی نەدەدا. ئەگەر ویستی ئاسمان نەبووایە " فەتحکردنی بەغدا"ش نەدەبوو.

ئەگەر خواوەند-یش بیویستبایە هاوپەیمانان بەو رێگەیە و بەو خێراییەی کە روویدا فەتحی بەغدا نەکەن، ئەوە هەر خۆی هیدایەتی فرعەون و خەڵکەکەی فرعەونی بۆ سەر رێگای راست و هەق و دادپەروەری دەدا تاوەکو ماڵ و موڵکیان لەدەست نەچێ و بەو دەرکردنە لەسەر خاکی عیراق

دەرنەکرێن. خواوەند لە کتێبی ئازیزی خۆیدا لە سورەتی ئەلروم دا دەڵێ ( و من آياته أن تقوم السماء و الأرض بأمره )، کەوابێ ئایا نەشێت سەرلەنوێ خاکی عیراق هەستێتەوە و " فەتحکردنی بەغدا " ڕووبدا تەنها بە فەرمانی پەروەردگارانەی خۆی نەبێ؟

ئەرێ ئایا " فەتحکردنی بەغدا" گێڕاندنەوەی ئەو گیانە ( الروح ) نییە بۆ عیراق کە دیکتاتۆر دزیبووی؟ ئەم گێڕانەوەیەش بە فەرمانی پەروەردگار خۆی نییە کە لە سوورەتی غافردا دەڵێت ( ذو العرش يلقي الروح من أمره على من يشاء من عباده ) ؟ ..

ئەگەر فرعەونی رافیدەین لە بەندە چاکەکار و بە وەفا و دڵسۆزەکانی خواوەند بووایە ئەوە خواوەند گیانی پێ نەدا وەك بەسەر بەندە چاکەکارەکانیدا دەیدا و هەر خواوەندیش فرعەونی رافیدەینی لە ناو نەدەبرد وەك پێش ئەو هەموو ستەمکارانی لەناو برد. ( قل جاء الحق وزهق الباطل، إن الباطل كان زهوقاً ).

ئەم وتارە هەرایەکی گەورەی لای پیاوە توندڕەووە ئاینییەکان و لای نەتەوەپەرستەکان و خەڵکی تر نایەوە لەوانەی کە دژی کەوتنی سەدامی سەرکوتکەر ( بتە گەورەکە) بوون.

ئەوەی کە دەمەوێ بیڵێم لەم کتێبەدا ئەوەیە کە : خەریکە زەنگەکانی ئازادی و دیموکراسی لەجیهانی عەرەبیدا لێدەدەن، عیراقیش، سەرەڕای ئەو هەموو خوێنەی کە ڕۆژانە دەچۆڕێ بە بۆنەی کاری دوژمنانی ئازادی و دیموکراسی لە سوری و ئێرانییەکان و خەڵکی تر لەو عەرەبە نامۆیانەی کە لە هەموو کون و قژبنێکی قوڵی خراپەوە هاتوون بۆ شەڕکردنی کاروانی ئازادی و دیموکراسی، هەر دەبێتە دەروازەی ئازادی و دیموکراسی بۆ جیهانی عەرەبی. ئەوەی کە ئێستاش لەعیراقدا هەیە بەرەنگاربوونەوە

(المقاومة )ی داگیرکەر نییە، بەڵکو بەرەنگارییەکە کە بریتییە لە دزیکردن و دەستدرێژی کردن و تاڵانکردنی کاروانی ئازادی و دیموکراسی. ئەوانەش کە لە عیراقدا کوژران و دروستکەری پاشەڕۆژی عیراقن مەبەستم لە ( سوپا و پۆلیس و خوێندکار و مامۆستا و پزیشك و زانایان و سیاسییەکان و نوسەران و رۆشنبیران و هی تریشە) چەندین ئەوەندەی ئەو ئەمریکییانەن کە کوژراون.

لایەنی بانگەواز بۆکراویش لەم کتێبەمدا گەلی عیراق و لیبراڵەکانی عەرەب و نەوەکانی پاشەڕۆژە. ئەوەی لەم کتێبەش چاوەڕوانی دەکەم ئەوەیە ئەو هیوا بەرینەی کە ئەم کتێبە بانگەوازی بۆ دەکا بهێنێتە دی کە ئەویش هیوای ئازادی و دیموکراسییە کە عیراق تا ئێستا گێمێکی گەورەی لێ بڕیوە سەرباری ئەو هەموو خوێنە زۆرە رۆژانەیی و بێگوناهەی کە لێی دەچێت، بەڵام ئا ئەوە باجی ئازادییە. ئەوروپا زیاتر لە ١٠ ملیۆن قوربانی باجی رزگاربوونی بوو لە نازیزم و فاشیزم لە جەنگی جیهانیی دووەمدا. ئەوروپای رۆژهەڵاتیش سەدان هەزار باجی رزگاربوونی بوو لە دیکتاتۆرییەتی سۆڤێتی. ئەو باجەش کە تا ئێستا گەلی عیراق داویەتی لە تەرازووی عەرەبدا زۆرە و زۆر گرانە، چونکە عەرەب تەنها لەسەر کاغەز و لە رەوانبێژیی عەرەبی و ئەفسونی بەیانی عەرەبیدا نەبێت مانای ئازادییان نەزانیوە. هەرچی ئازادییە ئەوە لەسەر زەمینی واقع زیاتر لە پازدە سەدە دەبێ نەهاتۆتە دی، لەکاتێکدا ئەو باجەی کە تا ئێستا عیراق داویەتی لە تەرازووی رۆژئاواییدا زۆر نییە، ئەو رۆژئاوایەی کە راهات لەسەر ئەوەی باجی زۆر و گران بدات بۆ ئازادی. تەماشایش بکەن کورد لە باکوری عیراقدا چ باجێکی گەورە و گرانیان دا لە شاڵاوەکانی ئەنفال و شاڵاوەکانی تری کوشتن و وێران کردن بۆ ئازادی و سەربەخۆیی خۆیان. ئەگەریش

پێتان وابێ کتێبەکەم نەگەیشتبێتە خوێنەری عێراقی و کوردی ئەوە من مۆڵەتی ئەوەتان دەدەمێ کە لە رێی خوا و لە رێی ئازادی وەریبگێڕنە سەر زمانی کوردی وەك چۆن کتێبی ( الحصافة Common Sense)ی هەڵگیرسێنەری شۆڕشی ئەمریکا تۆم پێن Pain دابەشکرا.

## تیرۆریزم

* لە هەندێ وتارتدا کە قسەت لەسەر دیاردەی تیرۆر کردووە لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا، تێبینیم کردووە کە تۆ لە ئاسۆ و ماوەی نزیکدا هیچ ئاماژەیەك نابینی بۆ نەمانی ئەم دیاردەیە. جارێکیشیان وتت تیرۆریزم کۆتایی نایەت و نابڕێتەوە تەنها بەوە نەبێت کە رووی رۆشنبیری و کۆمەلایەتی و سیاسیی جیهانی عەرەبی بگۆڕێت.. ئەمە ڕاستە ، بەلام پرسیار ئەوەیە چۆن ئەم گۆڕانە روودەدات و کەی ئەم گوتارە کە رۆشنبیرانی عەرەب و تەنانەت هەندێ لە سیاسییەکانیش دەیلێنەوە لە دروشمەوە وەردەچەرخێ بۆ کار و ستراتیژێکی عەرەبیی ئیسلامیی پەیڕەوکراو لە تەواوی ئەو وڵاتانەی کە بەدەست ئەم ئافاتەوە دەناڵێنن؟ کێشەکە ئەوەیە گۆڕان بۆتە گوتارێکی سەرمەدیی بە بێ ئەوەی گۆڕانی بەسەردا بێت ! واتە بێ ئەوەی خۆی وەکو گوتار یان دروشم یان بانگەواز یان ئاراستەیەکی ئایدیۆلۆژیی کە راستگۆیی لەدەستداوە، تێبپەڕێنێت. بە ڕای تۆ رووی رۆشنبیری و کۆمەلایەتی و سیاسیی جیهانی عەرەبی چۆن دەگۆڕێت و لەم فەزا جیهانیيەی ئێستادا مەرجەکانی ئەو گۆڕانە چین و کێ-یش بە دیی دەهێنێت بە تایبەت لە سایەی کۆمەڵە رژێمێکدا کە دەزانین زۆربەیان رژێمی نادیموکراتین ئەمە ئەگەر نەڵێین تۆتالیتاری و دیکتاتۆرین ؟!

_ گۆڕان پرۆسەیەکی زۆر دووروودرێژە. ئەورووپا پێویستیی بە دوو سەد ساڵ بوو بۆ ئەوەی بگۆڕێت، هێشتاش پێویستیی بە کات هەیە بۆ ئەوەی زیاتر بگۆڕێت. ئێمە لەجیهانی عەرەبیدا دەگۆڕێین، بەڵام زۆر بە هێواشی و وەك بەردی ئاوێك کە ڕێ دەکا، ئەمەش شتێکی سروشتییە. چونکە کەڵەکەبوونە ئاینی و کولتوورییەکان کە چەندین تەن کلسی کەڵەکەبووی بەسەر عەقڵی عەرەبییەوە دروست کردووە زۆر گرانە لە شەو و ڕۆژێکدا نەمێنێت، بە تایبەتی کە ئێمە تا ئێستا لە دەسەڵاتی دامەزراوەی ئاینی ڕزگارمان نەبووە و نەمانتوانیوە بە تەواوی ئاین لە دەوڵەت جیا بکەینەوە و ئاین بکەینە هی نەتەوە نەك هی دەوڵەت، بیکەینە هی خەڵك نەك هی پیاوانی سیاسەت بۆ ئەوەی پیاوانی سیاسەت ئاین لەبەرچاو ون نەکەن و نەیکەنە دامەیەك بۆ بەدیهێنانی مەرامەکانیان وەك ئێستا وای لێهاتووە.

سەبارەت بە تیرۆریزم-یش، تیرۆریزم کۆتایی نایەت تەنها بەوە نەبێت کە بونیاتی سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئابووریی عەرەبی بگۆڕێت. تیرۆریزمیش وەك بازرگانیکردنە بە ماددەی بێهۆشککەر و بازرگانیی بەسۆزانی و قومارکردن و ئافاتی تری کۆمەڵگا. لە ناوبردنی تیرۆر بە کوشتنی تیرۆریستێك یان هەزار تیرۆریست نییە، هەروەك چۆن لە ناوبردنی بازرگانیکردن بە ماددەی بێهۆشکەر بە کوشتنی بازرگانێك و قاچاخچییەك یان هەزار بازرگان و قاچاخچی ڕوونادا. لە ناوبردنی سۆزانیش بە کوشتنی سۆزانییەك یان هەزار سۆزانی نییە. ماوتسی تۆنگ دەیان هەزار کەسی سۆزانی لە چین و بە تایبەتیش لە شەنگهایدا کوشت. خومەینی-یش لە ئێران هەمان شتی کرد بەڵام سۆزانی هێشتا لە چین و ئێراندا هەر بڵاوە، چونکە کۆمەڵگا زۆر نەگۆڕاوە. گۆڕانی کۆمەڵگاش ڕوونادا تەنها بە گۆڕانی بەهاکان نەبێت. تیرۆریزم-یش تەنها بە کوشتنی تیرۆریستان لە ناونابرێ بە

ڵکو بە لەناوبردنی چاوگەکانی تیرۆریزم لەناودەبرێ کە بریتین لە فێرکردنی ئـاینی و ئـابووریی ئـاینی و کۆمـەڵگای ئـاینیی توندڕەو و ئـەو پیـاوە ئاینییانەی کە فتوا سیاسییەکانیان ئاین لەبەر چاو وون دەکەن، ئەو فتوا سیاسییانەی کە پێشتر پارەکەیان دراوە.

ڕێگا بۆ گۆڕان لە جیهانی عەرەبیدا لـە سووربووندایە لەسەر ڕۆیشتن بـە ڕێگای ئازادی و دیموکراسی و بەخشینی ماف تەواو بە کەمینەکان و داننـان بەویتردا.

## داگیرکەر

* لە چوارچێوەی ڕوانینی خۆتدا بۆ دیمەنی عیراق و ئەوەی لەبارەیەوە دەوترێ، ڕەخنەت لە دەستەواژەی داگیرکەر گرتووە، بێگومان دەزانین تۆ لەگەڵ هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی داگیرکردندا نیت و ئەوەشت لە وتارێکتدا وتووە کە چاکم لە بیرە، بەڵام لەگەڵ حاڵەتی عیراقدا بە شێوەیەکی جیاواز و بە چەمکێکی تەواو جیاکار سەیری مەسەلەکە دەکەیت. تۆ وای دەبینی کە عەرەب جیاوازی ناکەن لە نێوان ئەو کۆلۆنیالیستەی کە بەبێ بانگ کردن و ئەو سوپایەی کە لـە سەر بنـەمای بانگێشتی خـەڵکی وڵاتەکە هـاتوون بۆ ئەوەی ڕزگاریان بکات لە حوکمێکی سیاسیی – وەك خۆت دەڵێ – ئـەوتۆ کە مەحاڵە بە هێزە خۆییە سیاسییە ناوخۆییەکان لابرێت. ئایا ئەمە مانای ئەوەیە ئەو ڕژێمـە عەرەبییانـەی کە گۆڕانیـان ناوێت و داواکاریی گـەلان و کۆمەڵگا عەرەبییەکان و ویست و خواستیان لـە کرانـەوە و دیموکراسـی و ڕێزگـرتن لـە مافـەکانی مـرۆڤ و کەرامـەتی مـرۆڤ دابین ناکـەن، ئـەوانیش مـەحکومن بـەوەی بکەونـە نێـو هـەمان ئـەو تەڵەیـەوە کە ڕژێمـی بـەعس لـە عیراقدا تێی کەوت، واتـە داگیرکردنـی وڵاتـەکانیان لەسەر بانگەشـەی گەلە

داپلۆسێنراوەکانیان وەك ئەوەی لەگەڵ حاڵەتی عیراقدا روویدا؟ پاشان ئایا ئەمە مانای ئەوە نییە داگیرکەر کە ئێستا لە وێنەیەکی زۆر خراپدا پێشکەش دەکرێت ئیدی بە بێ چوونە ناو وردەکاری و بە بێ هیچ دەستنیشانکردنێکی هۆکارەکانی و ئەوانەی بەرپرسی راستەقینەن لێی، رووداوێکی ئیجابییە هەروەك بیرمەندی عەرەب هیشام جەعیت وای بۆ چووبیوو بۆ ئەوەی گۆڕانکاریی خوازراو لە جیهانی عەرەبیدا رووبدات؟

_ وەك لە وتارێکی رابردوودا وتوومە، بەڵێ دەبێ لە نێوان داگیرکردن Colonization و چوونەجێ Supplantation دا جیاوازی بکرێت.
داگیرکردن دابەزینی هێزگەلێکی بیانییە بۆ سەر وڵاتێك بەبێ ویستی ئەو وڵاتە و هاووڵاتییەکانی، ئەوەش لە پێناوی کۆلۆنیکردنی ئەم وڵاتە و دەستگرتن بەسەر سامان و تواناکانیدا. ئەوەی لە عیراقدا روویدا تەواو پێچەوانەی ئەوەیە. ئەو هێزانەی کە دابەزینە سەر خاکی عیراق عیراقیان لە فەرمانڕەواییەکی سەرکوتکەر و رژێمێکی فەرمانڕەوایی داپلۆسێنەر رزگار کرد. گەلی عەرەب و گەلی کوردیان رزگار کرد و ئێستاش دادگایی ئەوانە دەکات کە گەورەترین تاوانیان دەرهەق بە عەرەب لە دوجێل و سەختترین تاوانیان دەرهەق بە کورد لە هەڵەبجە و ناوچە کوردییەکانی تردا کرد. ئەو گروپە تیرۆریستییانەش کە ئێستا رۆژانە لە عیراقدا روودەدەن بۆ هەڵنەهێشتنی ئەم داگیرکردنە نییە، بەڵکو بۆ نەهێشتنی هەموو سیماکانی ئازادی و دیموکراسی و دەستگرتنە بەسەر کاروانی ئازادی و دیموکراسیی عیراقدا وەك چۆن عەرەبە کۆچەرییەکان دەستیان بەسەر کاروانەکانی بازرگانیدا دەگرت. لەبەر ئەوە دەبینی ئەو سیاسییە عیراقییانە تیرۆر دەکرێن کە تا ئێستا بەشدارییان لە بونیادنانی دیموکراسیی عیراقدا کردووە. داگیرکەر بە عیراقییەکان نالێت : ئەگەر دەتانەوێ هەر سبەینێ

پاشەکشە بکەم ئەوە من ئامادەم بۆ ئەو کارە، لە مێژوودا هیچ داگیرکەرێك شتی وای بە گەلانی داگیرکراو نەوتووە، هەرگیز شتی واشمان نەخوێندۆتەوە، بە تایبەتی کە مێژووی ئەمریکا مێژووی داگیرکردن نییە بەڵکو وەك دەزانین مێژووی ئازادییە، بۆش-یش ناتوانێت - تەنانەت ئەگەر وەکو تاکەکەس شتێکی واشی بوێت - کە ببێتە ناپلیۆنی نوێ، یان شا جۆرجی پێنجەم و ئیمپراتۆری عیراق وەك چۆن جۆرج-ی پێنجەم شای بەریتانیا ئیمپراتۆری هیند ( ١٩١٠-١٩٣٦)بوو، ئەمە نەك لەبەر ئەوەی لە توانایدا نییە ئەو کارە بکات، بەڵکو لەبەر ئەوەی رۆشنبیریی سیاسیی ئەمریکی و مێژووی سیاسیی ئەمریکا رێی ئەوەی پێنادەن. لەم رووەوە هیچ کەلەپورێکی کۆلۆنیالیستیی ئەمریکی نییە کە بۆش یان ئەوەی کە لە دوای بۆشەوە دێت چاوی بخاتە سەر تاوەکو عیراق وەربچەرخێنێ بۆ گەوهەرێك لە تاجی ئەمریکا وەك چۆن هیند گەوهەرێکی تاجی بریتانیای خاوەن مێژووی کۆلۆنیالیستیی دووروودرێژو سەردەمدار بوو .

رژێمە عەرەبییەکان هەر هەموویان دژی ئەوەن کە لە عیراقدا روویدا و روودەدات، دژی ئازادیی عەرەب و ئازادیی کوردن. بەرژەوەندیی فەرمانڕەواکانیان دژە بەوەی لە عیراقدا روودەدا لە رووی بنیادنانی سیستمێکی سیاسیی دیموکراسیی ئازاد. سوریا ئێستا هەموو قورسایی خۆی دەخاتە سەر عیراق، هەروەها لیبیا ـ ش و رژێمی تریش لەرژێمە عەرەبییە دیکتاتۆرییەکان. ئازادی و دیموکراسیی عیراق ئەو سووتێنگەیەیە ( المحرقة ) کە دیکتاتۆرییەکانی عەرەب دەسووتێنێت ئەگەر هاتوو دیموکراسی لە عیراقدا بونیاد نرا.

## ڕۆشنبیر ـــ ی عەرەبی

* لەسەر هەڵوێستی لاوازیان یان خەجاڵەتکەریان لە ئاست ئەوەی کەبەسەر عیراقییەکاندا هات لەسەر دەستی ڕژێمی سەدام لەو کارەساتە مرۆییانە و تاوانە گەورانەی کە بەعس کردوونی، هەندێ جار دەتبینین ڕەخنەیەکی توند ئاراستەی ڕۆشنبیرانی عەرەب دەکەیت و، زۆریشیانت بە ستایشکەری سەرکوتگەر ناوبردووە. ئەم هەڵوێستەت بیر دەخەمەوە بۆ ئەوەی لەسەر ئەم کێشە راستەقینەیە کە لەگەڵ ڕۆشنبیر-ی عەرەبیدا یان بابڵێین زۆربەیان - بۆ ئەوەی نەکەوینە ناو زمانی گشتاندنەوە- رووبەڕوومان دەبێتەوە پرسیارت لێ بکەم. ئەپرسم: ئایا هۆکاری ئەوەی زۆرێك لە ڕۆشنبیرانی عەرەب دەچنە پاڵ ڕژێمە عەرەبییەکان چییە و، گریانی میدیایی و گوتاری و تیۆریزەکاریی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆیان بۆ نەمانی هەندێ نموونەی ئەو ڕژێمانە چییە کە ڕژێمی ئێجگار خوێناوی و نامرۆیی بوون و نموونەی تریان - هەر وەك د. بورهان غەلیون ی بیرمەند دەڵێت - کە ڕژێمی دیکتاتۆری و ستەمکارن و زۆر لە مێژە ڕەوایەتیی خۆیانیان لە دەست داوە و هیچ هۆکارێك نەماوە بۆ مانەوەیان؟ ئایا ڕۆشنبیر-ی عەرەبی بۆچی لە ئاست ئەوەی بەسەر کورد و شیعە و زۆرێك لە سوننە پێشکەوتنخواز و عەلمانییەکاندا هات بە درێژایی حوکمی داپڵۆسێنەری سەدام، بێدەنگ بوو؟ بۆچی خاوەن ویژدان و پەیامە ئەخلاقی و ڕەخنەییەکانی ناو ڕۆشنبیرانی عەرەب وایان لێهاتووە بوونەتە توێژگەلێکی نائامادە و پەراوێزخراو و ڕاگەیاندنی عەرەبی بایەخیان پێ نادا و تیشکیان ناخاتە سەر لە کاتێکدا زۆربەی کەناڵە عەرەبییە میدیاییەکان لاف ئەوە دەدەن کە سەکۆگەلێکن بۆ گوزارشت کردن لە ڕا و

ڕای ئەویتر؟ کوا ڕای ئەویتر لە بەرامبەر ڕای ئەو ئایدیۆلۆژیستانەی کە خۆیان بە ڕۆشنبیرانی جیهانی عەرەبی لەقەڵەم دەدەن؟ تۆ چۆن دەڕوانیتە ئەم مەسەلانە؟

_ ڕۆشنبیرانی عەرەب، ڕۆشنبیریی عەرەبین. ڕۆشنبیریی عەرەبییش ڕۆشنبیریی وەڵامدانەوەیە نەك ڕۆشنبیریی پرسیارکردن. بەو مانایەی ڕۆشنبیریی عەرەبیی لە چواردە سەدەی ڕابردووەوە ڕاهاتووە کە وەڵام بداتەوە نەك پرسیاری لێ بکرێ یان پرسیار بکات. پرسیار لە ڕۆشنبیریی عەرەبیدا قەدەغە و حەرامکراوە. ئیبن ئەلموقەففەع و حەلاج و مهیار ئەلدیمەشقی و جەعد بن درهەم و ئەبو زەر ئەلغەفاری و هی تریش کوژران و ئازاردران و لە خاچدران و زیندانی کران تەنها لەبەر ئەوەی پرسیاریان کرد و، وتیان ( بۆ ؟ ). من لە دوا کتێبی خۆمدا بە ناونیشانی ( بۆچی ؟ پرسیارەکانی عەرەب لە سپێدەی هەزارەی سێیەمدا ) ( لماذا؟ أسئلة العرب في مطلع الألفية الثالثة ) لە پێشەکییەکەیدا وتوومە: بۆچی؟ بۆچی-یش نیشانەی پرسیارکردنمان وەك ناونیشان بۆ ئەم کتێبە هەڵبژارد ؟ وەڵامی ئەمە ڕوونە. ڕۆشنبیریی عەرەبی زۆر لە مێژە بەوە ناسراوە کە ڕۆشنبیریی وەڵامدانەوەیە نەك ڕۆشنبیریی پرسیارکردن. زۆربەی جاریش پرسیارکردن بە تەنها قەدەغە نییە، بەڵکو حەرامکراویشە. هیچ نەتەوەیەکیش سزای پرسیارکەرەکانی نەداوە وەك ئەوەی کە نەتەوەی عەرەب سزای پرسیارکەرەکانی داوە. ئەو ڕۆشنبیر و فەیلەسوف و فەقیە و دانایانەش کە بە درێژایی ١٤ سەدەی ڕابردوو زیندانی کران و ئازاردران و هەڵواسران، هەر هەموویان قوربانی پرسیارکردنیان بوون.

## دیموکراسی

* بە پێچەوانەی زۆربەی چاودێرانی سیاسیی گۆڕەپانی عێراق و پاشەڕۆژی ئەم وڵاتەوە کە وڵاتێکە ئێستا لە بارودۆخێکی سیاسی و ئارامی و ئابووریی ئێجگار نامەمواردا دەژی، دەتبینین لە ئاست ئەو هەڕەشانەی کە کۆمەڵگای عێراقی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە و ئەو هیوا و ئاواتانەی کە پەیوەستن بە دیموکراتیزەکردنی عێراقەوە، دیموکراتیزەکردن وەك پرۆژەیەکی جێگرەوە و نەهێڵەری کەلەپوری بەعسیی دیکتاتۆریی، تۆ ڕەشبین نیت. لە وتارێکیشدا ئاماژەت بۆ وتەیەکی ئەریك دیڤیز-ی بەڕێوەبەری سەنتەری لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵات ناوەڕاستییەکانی زانکۆی ڕۆتگێرز-ی ئەمریکی کردووە کە لەبارەی کۆمەڵگای عێراقییەوە وتویەتی و وای دەبینێ - وەك لە وتارەکەتدا باست کردووە- کە ڕەگ و ڕیشەی دیموکراسی لە عێراق لەکۆمەڵگا مەدەنییەکەیدا لە هەر وڵاتێکی عەرەبی دی زیاتر ڕۆچووە و کۆمەڵگای دیموکراسیش لەعێراقدا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەیەکی تەواو ئەو کاتەی کە لە ساڵی ١٩٠٨دا لە بەغدا کۆلێژی یاسا دامەزرا کە دێرینترین دامەزراوەی فێرکاری پێشکەوتووبوو لە جیهانی عەرەبیدا. لە ساڵانی دوای ئەوەش مامۆستایان و خوێندکارانی زانکۆکان و پیشەوەران توانیان کۆمەڵە و یەکێتی و یانە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیان پێك بهێنن. یەکەمین بنکەی ڕۆشنبیریش لە ساڵی ١٩٢٦ دا دابمەزرێت و سیمای تری مەدەنییانە کە تۆ و هەروەها دیڤیز-یش بە پێداویستیی بنەڕەتیتان لەقەڵەم داون بۆ بونیادنانی دیموکراسی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەت بۆ کۆمەڵێ مەرجی بنەڕەتی کردووە کە پێویستە بە ئامانجی بەدیهێنانی دیموکراسی لە عێراقدا ئیشیان لەسەر بکرێت، یەکەمینیان:

نەگەڕانەوە بەیەکجاری بۆ فەرمانڕەوایی سەراپاگیر ( شمولی)، پاشان پاراستنی دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و، پشت بەستن بە سیاسەتی بازاڕی ئازاد و دروستبوونی دادگەرییەکی سەربەست و خاوێن، پرسیاریش ئەوەیە: چۆن دەتوانرێ دیموکراسی بەدی بهێنرێ لە کاتێکدا ئێستا عیراق لە ژێر هەلومەرجێکی سەخت و دڵڕەقی ئەوتۆدایە بواری چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان و کێشە سیاسییەکان و چارەکردنی کێشەی نائارامی و خراپتربوونی توندوتیژی و تیرۆر نادات تاوەکو بەشێوەیەکی پرۆگرامکراو و عەقڵانی بچێتەسەر بەدی هێنان و فەراهەمکردنی ئەو ڕەگەزانەی کە باست کردوون و بە کۆمەڵە مەرجێکت داناون بۆ دیموکراتیزەکردنی عیراق؟!

_ وەك پێشتریش وتمان، پێویستە گەلی عیراق وای دانەنێ بەدیهاتنی ئازادی و دیموکراسی هەروا کارێکی ئاسانە و قوربانی ناوێت. تەماشای ئەورووپای ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات بکەن چییان کرد و چییان لە قوربانی پێشکەش کرد لە پێناوی بەدیهێنانی ئازادییاندا. خۆ ئەگەر گەلی عەرەبیش ئازادی نانرخێنێ ئەوە گەلی کورد ڕێز لە ئازادی دەنێت زیاتر لە گەلی عەرەب کە لە چواردە سەدەوە گرەو لەسەر کۆیلایەتی دەکا. تەماشاکەن گەلی کورد لە نیسانی ۲۰۰۳دا چۆن بە گوڵ و گۆرانی و سەما و بونیادنانەوە پێشوازیی لە رزگاربوون کرد، تەماشاش بکەن گەلی عەرەب لە عیراقدا چۆن بە ئۆتۆمبێلی TNT ڕێژکراو و بە خوێنڕشتنی ڕۆژانە و بە کوشتن و وێرانکردن پێشوازیی لە رزگاربوون کرد. لەم ڕووەوە گەلی کورد زۆر لە عەرەب شارستانیترە، ئەو سەقامگیری و بونیادنانەش کە لە ناوچە کوردییەکاندا دەیبینین بەڵگەی شارستانییەتی ئەم گەلەیە. ئەو ئاژاوەیەش کە لە ناوچە عەرەبییەکاندا هەیە بەڵگەی هەمەجییەتی عەرەبە لەو ناوچانەدا. بەدی هێنانی ئازادی و دیموکراسی لە جیهانی عەرەبیدا دەبێ

کەڵەپووری نووسینەکانی نابولسی لەسەر ڕژێمی بەعس لەعیراقدا (١٩٦٨ - ٣-٢٠٠٣)و، لەپێناوی گەلانی عیراق‌و داکۆکی کردنی لەگەلی کوردو پشتگیریی کردنیشی لەپرۆسەی ئازادی، کەڵەپوورێکی ڕۆژنامە ـ نووسی‌و ڕۆشنبیریی دەوڵەمەندە. بەدرێژایی چوار ساڵی ڕابردوو، واتە لەگەرمەی دەستپێکردنی پرۆسەی ئازادیی عیراقەوە ٢٠٠٣/٤/٩ هەمیشەو بەپێی بوارو تواناو کات چاوێکمان لەسەر ئەو ئەدەبییاتە میدیایی‌و ڕۆشنبیرییەی جیهانی عەرەب بووە کە تایبەت بوون بەم ڕووداوە گرنگە. لەو ئاستەدا جگە لەچەند ناوێك هیچ نوسەرێکی تری دیاری عەرەبمان نەدیوە وەك د. شاکر نابولسی ڕەخنەی لەستەمکاریی بەعس گرتبێ‌و خاوەن تێگەیشتنێکی جیاواز بێت بۆڕوخانی ئەو ڕژێمە.

نابولسی لەگەڵ ئەم ڕووداوە مێژووییەدا دەست بەنووسینی دەیان و سەدان وتار لەکەناڵ‌و ڕۆژنامەو سەکۆو ماڵپەڕە جیاوازەکاندا دەکات بۆ ئەوەی لەم پرۆسەیەدا ئازادبوونی گەلانی عیراق بەرووداوێکی گرنگ بنرخێنێ، بۆ ئەوەی لەناو هەلای ترسیش لەداگیرکاریی ئەمریکا، ئەو دەسکەوتە مێژووییە بەکەم نەگیرێت کەرزگاربوونی عیراقییەکانە لە دیکتاتۆرترین ڕژێم لەدنیادا. ئاستێکی تری فکری نابولسی بەرخستنەوەی کێشەی کوردە لەعیراق‌و داکۆکیکردنێکی ویژدانییانەو ئاکارییانەیە لەم کێشەیە، دواتر هەڵوێستوەرگرتنی ڕەخنەگرانەش لەزۆر بڕگەی مێژوویی کە لەدوای پرۆسەی ئازادیی عیراقەوە دێنەگۆڕێ.

**عەدالەت عەبدوڵڵا**

(٢٥٠٠) دینار

لەبڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیروهۆشیاری ی. ن. ک

٢٠٠٩